سرشناسه : نجاری، محمدسعید، ۱۳۳۵ -

عنوان و نام پدیدآور : دەسنویژی شیعر/ محەمەد سەعید نەجاری (ئاسو).

مشخصات نشر : سنندج: کانی کتیب: شوان، ۱۳۹۵.

مشخصات ظاهری : ۳۹۵ ص.؛ ۱۴/۵×۲۱/۵ س‌م.

شابک : ۹۷۸-۶۰۰-۷۹۶۸-۱۹-۲

وضعیت فهرست نویسی : فیپا

یادداشت : کردی.

موضوع : شعر کردی -- قرن ۱۴

موضوع : Kurdish poetry -- 20th century

رده بندی کنگره : PIR۳۲۵۶/س۱۳۹۵۷۴۳ ۳ن

رده بندی دیویی : ۸فا۲۱/۹

شماره کتابشناسی ملی : ۴۳۱۸۶۳۷

# دەسنوێژی شیعر

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

١٣٩٤

## ناسنامەی کتێب

**دەسنوێژی شیعر**

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

**هەڵەگری: نەجمەدین براخاسی (هەوار)**

**دیزاین: سەیران (سەمەن) پەرویزی**

**ناشر: کانی کتێب**

**ناشر همکار: شوان**

**نوبت چاپ: اول/۱۳۹۷**

**ناظر چاپ: شوان طاهری**

**شابک: ۰-۱۹-۷۹۶۸-۶۰۰-۹۷۸**

**تیراژ: ۱۰۰۰ جلد**


---




**مرکز پخش:** کانی کتێب

**+۹۸ ۸۷ ۳۳۱۲۵۲۵۹**

۱۳۹۴

# پێڕست

## بەشی کوردی

## بەشی فارسی

لـەو گـەڵا زەردانـەوە ئینسـان بـە پـاییز پـەی دەبـا
گوڵ هەیە؛ ئەمما هـەر ئـەو زریانـەیـە نـەشئەی دەبـا
وا دەروونم بۆتە کانگەی زەردی ڕەنگ و هەڵوەریـن
جێی نەماوە بۆ غەمێک؛ ئەمما هـەتا سـەر مـەی دەبا
ڕاستە مەی دەرمانە بۆ غەم، مـن وەهـا مـاتم، مـەیـیش
وەک نیگای چاوێکی تۆ پەی بە دەروونم کەی دەبا؟
بـۆ شـکاتی دەردی دووری نـەی دەناڵـێنێ بـەکـوڵ
شـیعری ئـاگرداری مـن هـاوارە، دڵ بـۆ نـەی دەبـا!
من خەزانی عاشقی کوا هەست دەکەم تا گڕ هـەبـێ؟
سۆزی عیشقم ئابڕووی سـەرمـا و کـرێوەی دەی دەبـا
کێ وەکوو من پادشـای کۆشـکی خـەیاڵـی دڵـیەتی؟
ئەرخەوان سووری ئەوینم کۆشکی مڵکی کەی دەبـا؟
بـاغی سـینەت چـاوەکـەم پـاوانی نـاوێ لێـی گـەڕێ
بـای خـەزانی زووڕەسـی پـیری هـەنـار و بـەی دەبـا
تـاوەکـوو تیشـکی تـەلایـینی بـەیـانی دەرکـەوێ
چاوی «ئاسۆ» ڕوو بە قیبلەی خۆرەتاو سـوجدەی دەبـا

ورمێ_ ٧٦/٨/٧

## تاسە

که زەردەی ڕۆژپەڕی ئێوارە هەڵدەکشێ بە سەر شاخا
پەپوولەی یادی ڕابردوو دەهارووژێن لە نێو ناخا
بە یادی ئەو چەلانەی چاوەڕێی ئاوڕێکی تۆ بوو دڵ
لە کاتێکدا کە وەک ئاسک ئەهاتی تۆ بە ڕێی باخا
لە ترسی گرشەگرشی چاوەکەت ئەستێرە هەڵناهات
پەنای بۆ شەو دەبرد تا بێ و لەوێ چارشێوی خۆی ڕاخا
لە دەشت و چۆم و کەژ بارانی خەندە و عیشق ئەبارێ بۆم
دەبوو فووی شادمانی فاتیحا بۆ مەرگی غەم داخا
دەئالۆزکا بە شەوبا پەرچەمت، پەنجەم دەبوو شانەی
کەچی نەمزانی ئاخر سەر دەکەی پەنجەم بە نێو زاخا
کەچی نەمزانی ئەم هەست و ئەوینەش پاییزی دادێ
کزەی زریانی خەم هەرگیز بزەی شادیم وەبەر ناخا
هەزار ئاواتی سەوزم چاوی ڕەشیان کاڵ بووە و ئێستا
دەبێ شین هەڵگەڕێن یەک یەک لە ناو توونی ڕەشی ئاخا
بەڵێ هەر وایە کردەی کۆخنشینی ڕووتی پێخاوس
دەبێتە شەربەتی پیاڵەی ئەوانەی وان لە نێو کاخا
بڵێی تا کەی وەها بێ چارەنووسی ئەم گەلە «ئاسۆ»؟
کە هەر ئاواتی ڕابوردووی بلاوێنێ لە تۆی داخا

بۆکان- ٢ی ڕێبەندانی ٧٤

سەرم گێژە کە بۆ لە منی هەژار ئەو یارە سەر نادا
گوڵم! داری بەزەت بۆ من چ قەوماوە کە بەر نادا؟
بە دووی تیشکێکی ئاواتی مەحاڵم دەربەدەر وێڵم
هەتاوی خۆشەویستی تۆ دەڵێی ئەم شەوقە هەرنادا
نەکەی تۆش دەربکەی هەستی ئەوینداری لە ترسی گەل
ئەوین ڕووی کردە هەرماڵێ لە پێشدا قەت خەبەر نادا
ئەمن شێتی و شەتاو و شەوق و شۆرم کردە دەسمایەم
کەسێ عەقڵی هەبێ شادی بە بەدبەختی و کەسەر نادا
کەچی من شادی و خۆشیم لە نێو عیشق و ئەگەردا دی
لە نێو گێژی ئەوین دیارە عەقڵ قەتقەت نەزەر نادا
ئەگەر وا بێ، ئەگەر چا بێ، ئەگەر تۆ بێ، ئەگەر کۆ بێ
دەزانم ئەم شەتاوەی من ئەبەد داری ئەگەر نادا
بەڵامهەرخۆم فیدای پەنجەی ئەوین بم هەرکەسێکی گرت
دەڵێی نێچیری ئەووەڵیە و سکاڵات قەت سەمەر نادا
پەریلەی دوور وڵاتی من! بزانە تا هەبێ «ئاسۆ»
بەرەو جادەی بەڵێنداری دەچێ و ئەو ڕێگە بەر نادا

بۆکان- ۷۸/۱/۱۱

## دڵ و گوڵ

هەر گوڵە و بۆ دڵ دەبێتە ڕووگە لەم گوڵزارەدا
هەر دڵە و بۆ گوڵ دەکورکێنێ لە نێو ئەم شارەدا
دەچمە سابڵاخ دڵ دەڵێ ئا ئێرەیە جێی گوڵچنین
دێمەوە بۆکان دەخنکێ دڵ لە ئەم پرسیارەدا:
بۆچی دڵ بۆ گوڵ دەناڵێ و گوڵ بە دڵ هەست ناکرێ؟
چاو چییە نەقشی ئەدی لەم گومبەزە دەووارەدا؟
پەنجەرەی دڵ چاوە، ئەی بۆ دڵ لە چاو خۆشبین‌ترە؟
ماڵی دڵ شێوێ کە پیری بۆ نییە لەو کارەدا
چاوی دڵ ڕوون بێ ئەدی نوور زەرد و سووری بۆ نییە
زەرد و سوور جوانی دەبەخشێ بەم خەتی پەرگارەدا
تاوەکوو سوور و سپی و سەوزی نەبینێ دڵ بە چاو
ڕۆژی ڕووناکی بەدی نایێ لە ئەم شەوگارەدا
ڕۆژی کورد ڕووناکە یارەب زۆر شوکور دیتم بە چاو
وا سنوور ڕێگر نییە لەم شیعرە پڕ دڵدارەدا
باری عامی داوە دێموکراسی بۆ «شەرقی وەسەت»
خوا شوکور جێی کورد لە شانی شاوەیە لەم بارەدا
پێم مەڵێن گۆڕا مەبەستی شیعرەکەی نا وا نییە
فەلسەفەی «ئاسۆ» ئەوینە جا بە هەر دوو بارەدا

بۆکان/ مهاباد_ ٨٦/٤/٢٣

## لەو سەرەوە

دار و بەرد و دەر و دەشت پاکی گیانی تێدا
هەر گوڵێ لەم دەوەنە بۆنی ژیانی تێدا
پێ بە سەر لاسکی گوڵدا تۆ خودا هێندە مەنێن
بە سەدان ئێسکی کچی نەرم و نیانی تێدا
لادە لەو فەلسەفە گەر باسی ئەوین حاشار دا
کۆنە گەر باسی شەش و چوار و سیانی تێدا
هەر شەقاوێکت ئەگەر بۆنی ئەوینت گوم کا
لادە لەو ڕێگە بزانە کە زیانی تێدا
ئەگە پێت خۆشە خودا ڕزق و پلەت لێ نەبڕێ
نانی کەس مەبڕە برا، هەر ئەوە نانی تێدا
بە کەم و زۆر نییە ژین خۆشی و ناخۆشی هەوە
ژینی خوێنمژ ئەوە مێژوو دەڵێ ژانی تێدا
ئاسۆ ئەم ڕێگە لەگەڵ یاری دڵ و گیان تەی کە
قەت وەڕەز نابی لە ئەو شوێنە جوانی تێدا

کۆسەـ ٨٢/٥/٢٠

## دەسنوێژی شیعر

بەم گەلاوێژەش دڵـم هـەر ئـارەزووی کوێسـتان ئـەکـا
ئـارەزووی بـۆنی شـەمامـەی نـەورەسـی بێسـتان ئـەکـا
گـەورەیـی عیشـقە کـەوا قیبلـەی دڵـم هـەر جوانییـە
دڵ وەکـوو حـاجی تـەوافی خاڵـی مـەحبووبـان ئـەکـا
گـەر بـە چـاوی دڵ تـەماشـای دەفتـەری شـیعرم بکـەی
تێـدەگـەی هـەر باسـی عیشـق و نیشـتمانی جـوان ئـەکـا
فەڕشی بەر پێم تا چەمەن بێ و پەردەشم چارشێوی گوڵ
کوا دڵم ئیـدی خـەیاڵـی کۆشـکی شـا و خانـان ئـەکـا؟
باڵــی سـەوزی هـەڵـفڕینی کـۆتری حـەز شـل بـووە
بۆیـە هـەر ئـاواتی تـاوێ سـەر خـەوی هـێلان ئـەکـا
هەر شـەتـاو و جۆگـەلـە و کانیـاو و چۆمێکـت کـە دی
باسـی کـۆڕ و مـەجلیس و بـەزمـی گـەلی یـاران ئـەکـا
ئــاهی ســاردی عاشــقانەی ســینەمــە بــۆ دەمبــەیــان
هەروەکوو ئاگر بە گڕپەی، جەرگـی شـەو بریـان ئـەکـا
وا لە ئاسـۆی دوورەوە سـۆزی بـە گوێمـدا دێ و دەڵـێ
هـەر لـە سـۆزەی شـاعیرانەی شـێتەکـەی بۆکـان ئـەکـا

مهاباد ـ ٧٦/٥/٢٧

## لە گەردەنەی سلاواتاواوە بۆ هەمەدان

گــەردەنــە هێنــد بــەرزە چــاوی تێــڕوانین ســەر دەکــا
تـکـتکـەی شـۆڕابەکـانی هـەر لـە هـی کـەوسـەر دەکـا
سەڵـوەتـاوا ئـەوپـەڕی مێـژووی گـەلی کـوردە ئـەگـەر
باسی دەنگ و حەنجەرەی سـەیید عـەلی عـەسکەر دەکا
دێگــولان و قــوروە وا کــەوتوونــە ســەر پشــتی چیــا
سـەد ئـەگـەر بێگانـەشـی کـەن باسـی کـوردی هـەر دەکا
تــا دەگــەیتــە «هــەگمــەتانــە» دەشــت و کێــو و ڕاســتییە
گوێ گری جوان، بەفری «ئەڵوەن» باسی «ئەسکەندەر» دەکا
مســتی ئــەو لــەم شــارەدا قووچــا بــە تــەگــبیری کــەســێ
بووعــەلی هــەر بۆیــە لێــرە کــورد بــە دانشــوەر دەکــا
بۆیـە زانکـۆی «کـورد ئـەلی» وەک چقڵـی چـاوی دوژمنـە
«بابــە تــاهیر» دارگوڵــی شــیعرە و چــرۆ و پــەل دەر دەکــا
سەد وەکوو «سیمین» ئەگەر «شیرین» بـێ نـاوی سـەیـر نییـە
چونکـە تیشـەی شیعری فـەرهـادانی کـوردی سـەر دەکـا
کێ ئەوەندە وەک «شەریف» ملـوێنکی شـینی شـیعرەکـەی
باســی تووســی نــەوزەر و ئــارێز و ســەر ئاویــەر دەکــا؟
هـەر بـەتـەنیـا شیعری ئاسـۆیە لـە نێـو جـەرگـەی جـەوان
جێـی جـەلالی چـۆڵ بـووە هـەر شـیوەن و چـەمبـەر دەکـا

گەردەنەی سەڵواتاوا_ سنە
٨٦/١/٢٧

## نیگا

چـاوەکـەت وا چـاو لـە چـاوی مـن دەکـا
تـیرەکـەی شووشـەی نـەناسـی کـون دەکـا
تۆش ئەگەر وەک من ئەسیری چاو نەبووی
غـەمزەکـەت بـۆ کـاری سـەد دوژمـن دەکـا؟
هـــەر نیگاییێکـــت لـــە چـــاو دەشـــنێتەوە
ڕێ لـــە ڕێبـــواری تـــەماشـــات ون دەکـــا
هـەر دڵـە بـۆ دڵ دەکورکـێ، چـاوەکـەم!
هـەر دڵـە و زۆر بـێحـەیـا شـەرمـن دەکـا
شـــاعیری ئاشـــق بـــە شمشـــێری شـــیعر
شـوورەیـی و شـەرم و شـکۆ جـنجـن دەکـا
مـن لـە چـاوی ئاشـقیش غـەم کـۆ دەکـەم
گـــەرچـــی تاڵـــی زەوقمـــان شـــیرن دەکـــا
بـــیری ئـــازادی و ڕەهـــایی میللـــەتـــێ
مـەسـخەرەی بـەنـد و قـەڵای ئاسـن دەکـا
شـــادی قـــەت ئاوماڵـــی حاڵـــی مـــن نییـــە
جـارێ دێ و دووسـەت کـەڕەت خـۆی ون
دەکـــــــــــــــــــــــــــــــــــــا
بۆیـە «ئاسـۆ» نـەرمـە ڕەوتی شـیعرەکـەی
بـیری سـەربـازی و قسـەی هـێمن[1] دەکـا

بۆکان/ مهاباد_ ٨٥/٦/١

---

١ -کوڕی دووهەمی ئاسۆیە لەو کاتەدا لە سەربازی بوو.

ماسی ئەوینی هەستی مـن لـە ئـاوی مـەنـدە ڕەو دەکـا
تیشکی هومێدە پاکـەکـەم گاڵـتە بـە مانگـەشـەو دەکـا
لێی گەڕێ با کۆشکی دڵم تیشکی برووسـکە لێـی بـدا
تاوەکـوو هـەسـتی کـا ڕەقیـب، تانـە ورەم پتـەو دەکـا
تۆز و غوباری ڕێگە وەک سورمەیی چاوی تێگـەیـین
زەین و خەیاڵی شاعیریم لەحزە بـە لـەحـزە نـەو دەکـا
دەنگی ئەوینی تۆیە وا چـەشـنی تریشـقە خـۆی نوانـد
ئێستەکە چاو بە مووی موژە ئەسرێ خەزانی کەو دەکا
قومری غەریبی ئارەزووم زەردەگەڵای بە چاو کە دی
مەنعی مەکەن بە ئارەزووی زەردە بەهێ‌یی سـەو دەکـا
تینووە کۆتری هەستی من؛ کورتە، شکاوە دەستی مـن
بۆیە شەڕابی خەستی من مەی‌زەدە زیددی خەو دەکـا
پەنجەرەکان پاکی بەرەو هـەتـاوی ڕەش خاڵـی دەبـن
کوانێ بزەی پەریلەکەم غونچـە بـە قـەسـتی لـەو دەکـا
دەرد و ژیانی سەخڵەتی تەنگـی بـە «ئاسـۆ» هـەڵـچنی
غوربەتی شێتی ئەسپی خۆر لە حـەیبـەتـا جـدەو دەکـا

غـەزەل بـا ئازیـەتی بگـرێ، جـەوانی تـازە هـەر دەڕوا
گولـم مـن پـیر بـووم تـۆ بـۆ جـەوانیـت وا هـەدەر دەڕوا؟
دەسـم لـەو ڕۆژەوە بـۆنی شـەمامـەی باغـەڵـی گرتـووی
ئـەوەنـدە بـۆ شـیعر مـەستە، قـەڵـەم تێیـدا بـە سـەر دەڕوا
بەڵام خۆ تـۆ خـەیاڵـی عاتیفـەت هێنـد ناسـک و سـووکە
بـە ئـاهی عاشـقانەی مـن وەکـوو عـومری بـەشـەر دەڕوا
ئەرێ بۆ کەس نەبوو جارێ بە شەو ئەستێرەیەک بگـرێ؟
من ئەستێرەی دوو چاوی تۆم بە شـەودا دیـوە گـەر دەڕوا
سـەدان جـارم چنیـوە نـەرگسـی تـەڕ لـەو گوڵسـتانەت
بـەڵام ئێسـتا بـەهـارم چـەشـنی پـاییز بـێسـەمـەر دەڕوا
شـەتـاو و چـۆم کـە گـۆرانی حـەزیـنی میللـەتم ئـەچـڕن
دەزانم وەرزی زسـتانی لـە خـاکم بـێخـەتـەر دەڕوا
گـەزیـزە شـین دەبـێ و مـزگێنی وەرزی بانـەمـەڕ دێنـێ
کچـی بێـری لـە بـۆ ڕان چـەشـنی ئاسـکی پڕنـەزەر دەڕوا
ئەوەی بۆ شنگ و گێلاخە دەر و دەشت و دەمەن دەگرێ
بـە دەنگـی خاڵـە ڕێبـوار وەک پـەپوولـە بـێزەرەر دەڕوا
لە دەنگی شیعری «ئاسۆ» «حاجی کیمـی»[1] ڕاچـەنی یـاران
کەسێ کێویش بە مـەعشـووقی نـەزانـێ بـێخـەبـەر دەڕوا

چۆمی قەرەگوێز ـ ٨٠/١٢/٣

---

١ - کێوێکی حەماسییە لە قەرەگوێز.

## هەوای سەردەم

سەیری ئەم گوڵزارە کەن چۆن تێیورووکاون شەتە!
رانەمەڕ خەوتووی پەچە و، شوان بۆتە دەس کیسی چەتە
دەرکی عیلم و تێگەیین قوفڵی نەزانی لێدرا
گەرچی خوێندکار و قوتابیش دەرسیان لا زەحمەتە
هێندەمان باسی بەدیهی کردووە و هیچ ناکرێ
شیعر و نەسریش لای خەڵک کەوتۆتە سەر ئاوی پەتە
شیعری ئاگردار ئەبینی هەڵدەلەرزێ وەک هەتیو
ناوەرۆکی باسی ڕۆمانیش هەناوی لەتلەتە
ئێستە شادی بووکی بنتارای ڕەشە و زۆر نابەدڵ
چۆپیگرمان دەرد و ئاخ و ئێش و ئۆف و حەسرەتە
جار بە جار هێندێ لە دەس ئەم تاریکە بازاڕەی هەڵێی
داخی جەرگت زۆر دەکا ئەو هاوەڵەی بێهیممەتە
ئیفتیخاری گەورەکەی خاریجەیە، پێرار کە چوو
خواردی دوو بیرەی لە باکۆ و بەمبەئی یا کەلکەتە
تۆش کە ئەهلی فەنن و فەزلی جارێ ترکاشەش نەچووی
بەحسی شیعر و عیلم و ڕامیاریش بکەی بێلەززەتە
کەس نییە هەنگاوێ هەڵبێنێ لە بۆ ئیسلاحی گەل
گەورەتر باسی سیاسیش ئیختیلافی دەوڵەتە
باڵی ئەم باشە و جەناحی ئەو خراپە و کۆنپەرەست
خۆ لە ئەسلا هەردوو باڵیش بەستراوی یەک پەتە
بێ کەس و ماف و هەناسە و پێکەنینە ئەو کەسەی

## دەسنوێژی شیعر

لـەم شـەڕی زەڕگـەریـەدا لاگـیر و سسـت و بـێخـەتـە
ڕیشـی بـێ ئـیش و درۆ بـەرپرسـی گـەل دیـاری دەکـا
لێـوی حـەقویـژی بـە قـامکی سسـتی یارانـت کـەتـە
غـیرەت و ئازایـەتی وا کـۆچی کـرد لـەم عـەسـرەدا
ئـەو شـتەی وەک پوولـی شـا بـاوی نـەمابـێ غـیرەتـە
سوور درۆت تەحویل ئەدەن مەجبووری ڕاستی ناو بنێی
ئـاوی تاڵـت پـێ بـدەن مـەجبـووری بێـژی شـەربـەتـە
ڕاوی نـێن داڵـی درۆ، قـومری سـەداقـەت ڕاگـرن
ئـەوپـەڕی پـەردەش ببیـنن بێتـوو کـڕ بـن زیللـەتـە
گـەر لـەبـەر دوو تیکـە نانـە دەک بـە ژەهـری مـاری بـێ
کوانێ قووت دەدرێ لە ژێر ئەم هەموو ڕەنج و زەحمەتە؟
ڕاپـەڕیـن و داخـوڕین بـۆ سـاندنی حـەق هـەر بـووە
باری شەرعی و دینەکەیشی فەرزە نەک هـەر سوونەتـە
چۆن لە داری سێو دەبێ تـۆ چـاوەڕێـی کاڵـەک بکـەی؟
پشت لە قەومی خۆت بکەی بۆ نان ئەویش بەو شیددەتە؟
چیای مەزن تا شین دەبێ هەرزن لەوێ سـەربـەرزە کـورد
بـەسـتە دوو بـزن و کلاشـێ ژیـنی ئـاوا دەرفـەتـە
گەورەیی و ژێردەستەیی وەک ئـاو و وەک ئـاگر دەچـن
خۆڵـی تـەرمـت گـەر بـە بـا کـەن بـۆ ولاتـت عیـزەتـە
کێ هەیە حـەز کـا لـە ژینا پێی بلێن پـەست و زەلیـل؟
لاوی کـوردا! هـەسـتە دەخـیلم، سـا درەنگـە، نـۆرەتـە
کیـژی ئـازای چاوشـەهـێن! چـاوی تـەماحیـان بێنـە دەر
تـۆ پـەتی سێدارە بـێشـک حـەڵقەحـەڵقەی کـەزیـەتـە

وا بــە زۆر پێتیــان لــە بــن کــوێنێکی ڕەش پــەســتاوتووە
مانگی ڕووت دەرخە لە بن ئەم هەورە تار و نەگبەتە
ڕوو لە «ئاسۆی» ڕوونی دوارۆژ کەن بەیان بەردانە شەو
تا بەکەی ژالەی گوڵی ڕووت دەنکی ئەم فرمێسکەتە؟
دڵــنیا بــن هــەر دەبــێ ڕۆژێ بــە ئــازادی بــژین
ئەی وڵاتە جوانەکەم! پیرۆز بێ لێت ئەو شەوکەتە!!!

بۆکان- پاییزی ٧٧

## شاری دڵ

**بۆ شاعیـری هاوڕێـم: ڕەحیم لوقمانی**

وەرە بڕوانــــە شــــاری دڵ چ هـــــارووژاوە! پـــــڕ دەردە
گوڵـی بـاخی زەمـەنـدی نـاخی دڵـداریم چ ڕەنـگ‌زەردە!
ســـەراســـەر شـــینە، هـــەڵـــقرچانە، هـــەر ســـووتانە، ناڵـــینە
گوڵـم! بـەشـکم بـە شـیعرێ تـۆ لـە ڕازم هـەڵـگری پـەردە
مـــەڵـــێ تینـــووی کـــەوا ڕەش بوونـــەوە نـــاخی نیگاکانـــت
وەکوو ئەندامی ڕێکت داری حەز سـەرسـەوز و بـێ گـەردە
لە سـەر لێـوت وشـەی شـیعرم دەڵـێی تیرێکـە پـڕ دووکـەڵ
هـەمیشـە چـاوڕێی کێشـانە، سـادەی گـڕ لـەویـش بـەردە
دەزانم تـەخـتی سـینەت جێـی قومـاری تاسـی ئیحساسـە
مـەهێڵـە بـێ‌هونـەر قـەت مـۆرە هـەڵـباوێتە ئـەو نـەردە
وەرە مـــن دارە تینوویـــەکـــی لاپاڵـــی چیـــای کـــوردم
شـەواوم وێـدە، ڕیشـەم کۆڵـە، بـن‌پـێم زەردومـا و بـەردە
لە بادەی جامی شیعری خەم گەلێ سەرمەست و ڕیسوا بووم
بـە لێـوی سـووری تـەڕ ئـاوێ لـە جـامی شـیعرەکـەم وەردە
منیش هەر گـەشـکەداری بـێ‌هـەواری دەشـتی هـەڵـبەسـتم
فیـدای چـاوانی تـۆ «ئاسـۆ» هـەتـا کـەی دیلـی ئـەم دەردە؟

سەقز_ ٧٣/٦/١١

## جێی کڵۆ بەردە

لــە نێــو باغــێ بــەهاریــدام و ڕەنگــم پــاییزێ زەردە
ئــەوەی هــەســتم دەبزوێنــێ شــنەی بــای ماتــەم و دەردە
دەمێکــە ژێــر چــەپۆکــەی ماتــەمێکــی ڕەنــگ بزرکــاوم
دەڵــێم ئــەمجارە بــێوەحشــەت لــە ڕازم هــەڵــگرم پــەردە
ئەوەی هەستی هەبێ لەم ژینە نەمدی هەندێ ڕووگەش بێ
لە تەختی سینگی پڕغەمدا هەموو کەس شەشدەری نەردە
عەزیزم! نــەوبــەهــار و ساڵــی ســاوا هــات و مــن غــەمگــین
بــەهــارێ تیشــکی ئــازادی نــەبــێ هــەر وەرزی نامــەردە
نەچی تۆش وا بهــاوێژی کوڵــۆی جــەورت بــەرەو ســینەم
لــە ئــەڵــمانێ کوڵــۆیێ بــاوی جێگــەی ئــاخری بــەردە
مــنی ئێســتا لــە حــەفتــا ئاسمــان بــێ شــەوقــی ئــەســتێرە
تروسکەی شۆرەت و ناوم لــە دونیــا ســاف و بــێگــەردە
هەزاران چڵکە هــەوری چــاوچنۆک بگــرن بــەری «ئاســۆ»
هەتاوی گەل بــەرەو ســەرکــەوتنــە، ڕووی دوژمــنم زەردە

بۆکان- جەژنی قوربانی ٧٦

## دەسنویژی شیعر

له نێو پۆلی گوڵی سووردام و ڕەنگی ڕەش پتر دیاره
بەڵێ وایه له شەوگارا ڕەشی سالار و سەرداره
خراپی کرد ئەوەی وای کرد و چارشێوی به گوڵدا دا
جوانی خۆی وەکوو نوره، چ باکی بەند و دیواره؟
لەگەڵ یەک ڕۆچنه پەیدا کا هەموو عالەم دەکا ڕۆشن
له نێو چۆمێکی ڕۆشندا ئەوەی ناپاکییه دیاره
گوڵی سوورم! لەبەر تۆیه هەدا نادەم به ڕۆژ و شەو
هەتا دوایین نەفەس هەر وا گوڵ و جوانیم لەسەر زاره
به پیریش لاوتره عیشقم، وشەم هەر وا تەڕ و پاراو
ترووسکەی بیری ئازادیم دژی تاریکی شەوگاره
ئەوەی شادی به دڵما بێ و ئەوەی گەر غەم بتارێنم
له خۆشی تۆیه لەم دونیایه بێ ئاوازی دڵداره
له خۆشی تۆ ڕەدیفی شیعرەکانم گۆشەیی عیشقه
لەبەر تۆ قافیەم زەربه، قەڵەم میزرابه، دڵ تاره
نەکەی «ئاسۆ» له ئاهەنگی ئەوینی خۆت بکەی خاریج
له کاتێکدا مەلی پیری له سەر داری پەلاماره

مهاباد_ ٨٥/٦/٨

# وەرە

ئـەی تریفـەی ڕۆشـنی شـەوگـاری تـەنیـاییم! وەرە
نم‌نمـــی بـــارانی وەرزی سالّـــی وشـــکاییم! وەرە
گەر دەپرسی چۆنـە حالّـی تازیـەداریم؟ دوور لـە تـۆ
سـەد ئـەوەنـدەی چـاوەکانـت شـین و دەریـاییم وەرە
کەی بەڵێنی ئـەمـن و تـۆ وا بـوو کـە ئـاوا بی لـە پـڕ؟
ئـەی سـوهەیلـی دەم بـەیـان و نـووری بینـاییم وەرە
خۆ منی سوختەی ئەوین لای تۆم خەتم کـرد عاشـقی
ئایـەتی سـوورەی ئـەویـنی وەرزی گـەرمـاییم وەرە
گەر دەزانی خولفی وادەی بەندەگیم کـردووە مـەیـێ
خـۆ ئـەمـن وەک گـوارەکانـت ئاڵـقەئاسـاییم وەرە
کۆڕی هەڵپەڕکێش دەچم هەر دڵ بە یادت پڕ خـەمـە
ئێســتە وا تێکــەڵاوی نێــوان شــیوەن و شــاییم وەرە
ڕۆژ نییـە سـوورێکی تـازەم پـێ نـەدا دەسـتاڕی ژیـن
هێنــدە هــاڕاوی گــەمــەی گــەردوونی مینـاییم وەرە
خـۆ دەزانم تـۆ ئـەوەنـد لـەیـلا دڵـی ون نـابی لـێم
ئێسـتە وا بـێ تـۆ وەکـوو مـەجنـوونی شـەیـداییم وەرە
بەختی من بۆخۆی ڕەشە، ڕەش‌پۆشی ناکەم ڕۆحەکەم!
تاوەکوو ئاسـۆی غـەمـی تـۆ شـێت و سـەوداییم وەرە

بانە/ سەقزـ ٨٥/٩/١٢

دەڵێی ئەم هەورە وەک من دڵپڕە و بارانی پێ خۆشە
عەرز وەک هەستی من وشکە و تەڕی جارانی پێ خۆشە
کەژ و کێو شاڵی سەوزی کردە بەر، کفنی دڕی یەکسەر
بەڵێ بەردیش لە ئەم وەرزە نەوای یارانی پێ خۆشە
بەهارە و بولبول و سێروو لە بادەی شەونمان مەستن
مەلیش هەر وەک بەشەر سەیرانی گوڵزارانی پێ خۆشە
کەسێ هەستی هەبێ لەم وەرزەدا شار کونجی زیندانە
بە حاڵ عەقڵی هەبێ سەیرانی ئێوارانی پێ خۆشە
گولاّن و خاکەلێوە وەک تەمەن زوو ڕادەبوورن ها!
کەسێ گوڵ شک بەرێ کوا پارکی نێو شارانی پێ خۆشە؟
گوڵ و بولبول، دەر و دەشت و ڕەفیقێک و قەراغاوێ
کە بێتوو دەست بدا، کێ سەیری بێکارانی پێ خۆشە؟
مەڵێن شاعیر خەیاڵی خاوە ئەو زۆر تیژترە چاوی
خەڵک زاری دەوێ، ئەو ماچی نێو زارانی پێ خۆشە
لە ئەم وەرزەی بەهارەدا «ئاسۆ» هێندێ بڕوانە
ئەگەر چاکسازییەک بکرێ لە بۆ تارانی پێ خۆشە

ڕێگای کۆسە ـ ٨٢/١/٢٧

## بەیتی ژین

ژیــان بــەیتێکــی بــێئــەنجامــە، چیرۆکێکــی ســامناکە
هـەمـووی باسـی پـەری و دێـو و فریشـتە و دێـو و ئـەلهاکـە
ئەگەر پێت وایە من چاکی ئەکەم بێهوودەیە من چیم؟
لــە دەســتی ئێمــە نایــێ ئــەو خراپــە، تــۆ دڵــت چاکــە
شـەهیـدی بـێ سـەر و بـێ شـوێنە ئـاواتی کـەمـێ شـادی
کە وابوو شۆڕشی گەورە بە غەم لەم چەرخە بەرپا کە
بە زللەش سووری کەی ڕووی خۆت، لە دەست زاڵم مەناڵێنە
بە خوێن سوور بێ سەری کوڵمت وەها ڕووسوورتری کاکە
فـەسـادە، زوڵـمە، بـێعـەدڵـی و درۆ ئـەمـڕۆ لـە کارایـە
لـە ئـەم تاریکـە بـازاڕەی چـرای عـەشـقێ موهـەییا کـە
نییە دوکتور لە عەشقی میللەت و حەق پاک و پیرۆزتر
ئـەگـەر سـەرکـەوتـنی ژینـت دەوێ هـەر لـەو تـەمـەننا کـە
بەشـەر مـەیلی بـە گـڵ زۆرە ئەگـەر ڕۆحی کز و لەڕ بێ
ئـەویـش چونکـا سرشـتی وی لـە ئـەسـڵا تێکـەڵـی خاکـە
بـرا بێهـوودەیـە، مـەیلـی هـەوای نـەفـس و دراو بـەسـیە
لـە نێـو قـەڕنی ئـەتـۆم ئێسـتا هـەژار هـەر دیـدە نمناکـە
بـەشـەر وا گـەییـە مانـگ و موشـتەری ناهیـدە ئـەمجـارە

کەچی هێستا خەمی نان بۆ گەلێ کەس ماری زەححاکە
لە سەر ڕەیلی هەوای خۆی چۆتە دەر ئێستا قەتاری ژین
قەتار چی! تۆش بەجێ ماوی، هەڵێ، فریای کەوە، ڕا کە
خەساری بۆ دەکەی تۆ کارەبای فیکرت لە کاتێکدا
کە باغە و کارەبا بێقەدرە ئەوڕۆ قیمەتی لاکە؟!
لە کوێستان قاسپەقاسپی کەو، لە شاریش هارەهاڕی ئەو
لە بۆ ئەهلی نەزەر دیارە لە ژیندا کامەیان چاکە
زمانی خۆت لەبەر چاو کەوتووە و مۆسیقە بێتامە
بە دووربینی ئەوینداری گەلت هێندێ تەماشا کە
دڕووی فەرهەنگی بێگانە لە چاوی لاوی ئەم عەسرە
وەکوو سورمەی ئەوینداری ئەوینێ بێغەش و پاکە
جەواڵ شەڵوارە، پاتۆڵ توورەکەی دۆ، دوگمە قاچاخە
برایان ڕێگە شێواوە، ئەمە کەی بەرگ و پۆشاکە؟
ڕفاقەت پیر و زورهانە، شەڕ و ئاژاوە هاوڕێیە
دە تۆ بی خوا پەری پاکی! کەمێکی دیش زگوزا کە
وەرە وەک فووی مەسیحا لاشی مردوو پاکی هەستێنە
بە ئاهەنگی سەحەر نووستووی وەتاغی پوولْ لە خەو ڕاکە
هەناسێکیش بدە بەو کوردە بێهەستانە وا نووستوون
بە شەوقی عیلم و زانین ماڵی چۆڵی کوردی ئاوا کە
بەڵێ تەنیا بە ناوی میللیەت ئێوە مەڵێن کوردین
جلێکی کردەوەش کاکە بە بالای گوفتەکەتدا کە
ئەگەر یەکتر بەجێ بێڵین لە تەنهایی شەوی ژیندا
گرانە سەختەڕێ ببڕین کە ڕێ دوور و ترسناکە

لـە فیکـری ژیـنی خـۆدا بـوون لـەسـەر ئـەم ئـەرزەدا نـەنگـە
له بۆ کێ سـەبتی کـرد یـەزدان قـەباڵـەی ژیـنی ئـەم خاکـە؟
زەوی سوفرەی هـەمـوو ئینسـانە زەرد و سـوور و ڕەش تێکـڕا
گـەلی کـوردیش لـە ناویانـدا شـەریکـێ بـێبـەش و تاکـە
خودایە ئاسـۆیێ ڕوون دەرخـەی لـە بـۆ ئـەم میللـەتـە، بـەسـیە
دەوای دەرد و نـەخۆشـی ئـەم گـەلـە بـێ مـاف و ئاڵاکـە

ساروقامیش ـ ٧٣/٥/١٢

## وا مەکە

هێند لەگەڵ من کێشە بەو دوو نێرگسی شەهلا مەکە!
دەورە سەخت و حەستەمە، ئەم شۆڕشە بەرپا مەکە!
چاوەکەت وا جوانە ڕەمزی خۆشەویستی بێ نە قین
دارە بی سەرسەوزی عیشقم، قەت لەگەڵ من وا مەکە!
تۆ لە نێو گوڵدانی شیعرا تا بمێنی گەشتری
تا گوڵیماڵی دڵم بی ئارەزووی سەحرا مەکە
گەر شەم و پەروانە باسێ کۆنە، فیکرت تازە بێ
دەم بەیانی شەم ببینە و کاری بێپەروا مەکە
تا دەپشکوون غونچە لەو باغەت مەڵێ دڵ دێتە کوڵ
گوێی دەیە قەت مەنعی ناڵەی بولبولی شەیدا مەکە
دیارە تۆش ڕێبواری شاری خۆشەویستیت چاوەکەم!
تەرزە لووکەی ساردی ڕێگای ژین بە سەر مندا مەکە
من خەتی چاوت لە سەر سەفحەی نیگا دەخوێنمەوە
گوفتی ویم لێ تێکمەدە، خۆت گێل و بێئاگا مەکە
ڕەمزی لێوانت بە «ئاسۆ» کوانێ هەڵدێ چاوەکەم؟
ئاشکرای کە وەک نیگاکەت هێندە من ڕیسوا مەکە

بۆکان ـ ٧٤/١١/٢٠

با هەناسەی شیعرەکەم بۆنخۆش بێ، زولفت شانە کـە
تـا بـزانی هـەروەهـا مـاوم لـە سـەر پـەیمانـەکـە
هێندە خاڵی بووم لە خۆشی، خۆزگە دەخوازم بە خەم
فورسـەتـە ساقی دەخـیلم! پـڕ کـە دەی پـەیمانـەکـە!
تۆ لە خـاکی هـەنـدەرانـدا هـەستی خۆماڵـی دەکـەی
من لە ماڵی خۆم غەریبم، چـاو لـە ئـەم دەورانـە کـە!
گـەر لـە خـاک و خـۆڵ بپرسـن چۆنـە تـامی دابـڕان
دێتە ناڵین چەشـنی ناڵـی، سـەیـری ئـەم هیجرانـە کـە!
دوێ لە سابڵاغا دەگریام بۆ خەمی دووریت؛ کـەچـی
چاو لە هـەڵـقرچانی دڵ لـەم مـەرکـەزی ترکانـە کـە!
من بە گەردن پێوە بـووم، تـۆ گـەردنئـازایی دەکـەی
تـۆ خـودا هـەر وا ئـەوینـتم بـۆ بـە داو و دانـە کـە!
تۆ پەری بوویت و بە باڵی گڕ لە کـن مـن هـەڵـفڕیت
ئاسیا جێی تۆی نەبوو؟ دەی ڕوو لە ئەو دورگانـە کـە!
هەر بە یەک نامە و پەیامێ ڕۆحی «ئاسۆ» گەش کەوە!
مانگی گوڵ هات و نەبـاری، چـاو لـە ئـەم بارانـە کـە!

میاندواو ـ ٧٨/٢/٢

## دەسنوێژی شیعر

حـەیفـێ کـە بـەری داری جـەوانی کـەم و کـەسـکە!
پارچـەی نـەشـەیـی بـۆ بـەری ئـەم عـومرە چ تـەسـکە!
ئـەی دڵ! وەرە لـەم باغـە گـوڵان بچنـە؛ مـەڵـێ بـۆ
تۆ مەردی موعەممای «چییە» نیت، فەلسەفـە بـەس کـە!
شـەرحـی هـەیـە یـا باسـی نییـە، بـۆ گـەلی بـەڵـگە
بـێ بـەڵـگە دڵـت لـەو مـەیـە بـێ وێنـەیـە مـەس کـە!
ئـەسـتێرە ژومـاری چییـە؟ کـوا حـەدد و ژومـاری؟
جوابی دمی کۆنفیکری بـە مستێ قـوڕی خـەس کـە!
هـەنگـوینی شـەمـەترووکـە بـەڵـێ شـیرینە؛ ئـەمما
دەسـتی کـە نـەدا تاڵـە، دە کـەم ئیـدی هـەوەس کـە!
مـن کـەنگـێ دەڵـێم داری بـەهـێ قـەیسـییە میـوەی؟
یا کەنگێ دەڵێم چاو لە هەوای ئـەهلـی جـەرەس کـە؟
تو چاو لە گوڵی عاشـقی ئـەو شـوێنە کـە شـین بـووی
ئاودێری گوڵی بـاغی بـە، ئـەو قـەومـە بـە کـەس کـە!
تـا یـادی پـەریلـەی کـەژ و کـۆی کـوردی بمێنـێ
شاباڵـی قسـەی لاوەکـی وەک کـەو لـە قـەفـەس کـە!
وەک «ئاسۆ» بە غەیـرەز گوڵـی ڕوو، سووری وەلا نـا
تۆش هەژگەڵ و چیلکەی ئەدەبی کوردی هەرەس کە!

قەڵەندەر ـ ٧٨/٢/٣

من ئەمڕۆ مات و بێهۆشم، دڵم تا حەز دەکەی تەنگە
زەمین و ئاسمانی خواش لە حاند ئەم دەردە بێدەنگە
نە شیعر و نەسر و پەخشانم زمانی حاڵی زاریمە
نە هەست و ویست و ئیحساسم وەکوو جارانی خۆی شەنگە
یەکێ نایێ هەواڵێکم بپرسێ بۆچی غەمگینم!
زمانی خۆشی دڵداریم لە شیعرا بێنەشە و لەنگە
ژیانم ژانە، هیوام پووچ و دەردم شەرمی لە دوایە
سرم گەر ئاشکرا بێ تێدەگەن چەن ڕازێ بێڕەنگە
هەموو کەس وەک منە؛ ئەمما فەقەت من دیل و ئاوارەم
لە بەحری چاوی جوانبینم شەتی فرمێسکی غەم پەنگە
مەڵێ بۆ دەردەداری؟ دەردی سالانم وەبیر دێنێ
تەرازووی بەختی ئەم کوردە لەمێژە نزم و لا سەنگە
حەرامە بادەی ئەم عەشقی خودایی بێ غەل و خەوشە
ئەوەی ئەمڕۆ حەلاڵە خوێنڕژان و جەردەیی و جەنگە
مەناڵە ئەی دڵی شەیدا! مەڵێ بۆ هەستی من سستە!؟
وەکوو پیری کلیسایی خەیاڵم چاوەڕێی زەنگە
دەراوی خۆشەویستی قووڵە، نامەحرەم دەخنکێنێ
لەوێدا بەحرەکەی سیدنی بە قەت یەک قەترە ئاوەنگە
یەکێ بولبول نەبێ وەک «ئاسۆ» قەدری غونچە نازانێ
لە نێو شاری گوڵان گیانە مژینی لێوی گوڵ نەنگە!

**دەسنویژی شیعر**

سەر مەزاری مامۆستا حەقیقی ـ ٧٧/١٢/١٦

## شەوەزەنگ

**بۆ گیانی بێتاوان کوژراوانی براکوژی**

ئەوەی ئەمڕۆ بە مێشکا دێ خەمی شیعری دڵتەنگە
بە جێی پیاڵەی بلووڕینی دەسی ساقی زڕەی زەنگە
هەتاوێکم بەدی کردبوو، بەیانی دیم کە پرشنگی
تکەی خوێنی برای خۆی بوو، بەڵێ حاشا شەوەزەنگە
هەتاو کەی وایە گەر ئاگر لە مێرگی کاکەشان بەردا؟
خومی سەر شانی ئەستێرەن، هەتاوی وا گەلێ نەنگە
ئەمن ڕۆڵەی بزەی لالە و شەقایق بووم کە ئێستاکە
دڕووی دوژمن لە چاومدا لە هەر چوار لاوە سێ بەنگە
هەناسەی پاکی ڕێحانەم بە ڕۆحم هەڵمژی و مەست بووم
کراسی سووری شەڕ تازە بە باڵای هەستی من تەنگە
گەلێ لەنگێزە بارانەم لە سەرما سۆڵەدا چەشتوون
برایان وا مەکەن توخوا، کەوانزێڕینە حەوت ڕەنگە
لە سایەی باوەشی یەکتر وەها نەخشاو و دڵگیرن
وەنەوشەش بۆ چەمەن مل کەچ دەکا هەر بۆیە هێند شەنگە
وەرە ئەی بولبولی شەیدا لە سەر گوڵ بار کە خێڵەوخوار
تەڕی سەر لێوی گوڵباخی تکەی ئەسرینی ئاوەنگە
منیش غەمباری وەرزێکی وەها پڕ ئۆف و ئازارم
لە «ئاسۆ» ڕەخنە قەت مەگرن تەرازووی تەبعی لاسەنگە

هاوینی ٧٣

## پەیکی شادی

کـــوردەواری! ڕۆژی هـــەوڵـــە چـــاوەکانـــت هـــەڵـــبڕە
تـــۆ فریشـــتەی، مـــن دەبیـــنم، باڵـــەکانـــت هـــەڵـــفڕە
بـای شـەماڵـی خاکـەلێـوەت بێنـە گـۆڕێ و پێـی بڵـێ
دێـوی بـێهـەسـت و ئـەویـنی زاڵـی بـاغم هـەڵـبڕە
بولبـولی گـۆرانیبێـژی جـوانی باغـت کـوا؟ بڵـێ
بێتـە بـاغ و بـێ چریکـەی وا بـەهـارە بـۆچ کـڕە
وا گوڵاڵـەی شـاخەکانـت سـوورە دەترووسـکێ لـە دوور
سـوورە وەک خـوێنی شـەهیـدانت ئـەوەی شـاخ و چـڕە
زۆر لـە ڕێـی ئـازادی و سـەربـەسـتی تـۆدا خـوێن ڕژا
ئێســتە ئــەو خوێنانــەیــە وا بوونــە پشــت و بڕبــڕە
دیوتــە چــۆن زەبــری پــەلامــاری دلێرانــت وەشــا؟
وای لە مـاری دوژمـنی کـورد کـرد کـە هێشـتا هـەر سـڕە
تـەپڵـی ئـازادی لـە گـوێی ئـەم کـوردە لـێ نـەدراوە هـەر
ئێسـتە گـوێ بگـرن گـەلۆ ئـەم تـەپڵـە دەنگـی چـەن زڕە
بـۆچی ناپرسـن لـە مـن لـەم لاوە چـۆن لـێم دەگـوزەرێ؟
حاڵـەکـەم چـەشـنی دڵـی مـەجنـوونی بـێلـەیـلا شـڕە
میللەتی کورد! بەسیەتی بێـت و لـە دەس چـێ ئـەم هـەلـە
ڕۆژی وا ئیـدی وە گـیری ناکـەوێ قـەت ئـەم گـەلـە

کـوردەواری بـەسـیەتی دوو دەسـتەگـی و لێـک جیایـەتی
وەرنــە بــاغی یــەکیــەتی و کۆشــکی بڵــیندی برایــەتی
بـێن ببیــنن ژیــنی سـەربـەسـتی چ خـۆش و دڵکـەشـە!
نۆکـەری یــەک سـاتی ئـازادی گـەلـێ بـێ شـایەتی
وەرنــە ســەیــری بــاغی ئــاواتی گــەلم هاتوونــە بــەر
بولبــولی خنکــاوی جــاران ئــارەزووی غــەوغایــەتی
مــەدرەســەی عیشــق و ئـەویــن دەرکــی کـراوە ئـاوەڵا
خۆشــەویســتی ئــەم وڵاتــە دەرســی مامۆســتایەتی
سـەنگـەری هـەسـت و شـەڕەف ئـاواتی هێناوینـە جـێ
خـوێنی سـەدهـا لاوی کـوردە و مـافی پێشـمەرگایـەتی
تۆ خودا ئیدی لە نـەفعی خـۆ گـەڕێـن چاوکـەن لـە گـەل
چـارەسـەر کـەن برسیەتی و بـێعیلمیـی نـاو کوردایـەتی
دیوتـە دوژمـن وا لـە داخـان شـێت و بـێهـۆقرە و کـزە
هــەر دەڵــێی لــەم چــەرخــەدا ئــازاری ماخولیایــەتی
گوێـو لـە دایکــی نیشـتمانمان ڕاگـرن پێمـان دەڵــێ:
ڕۆڵــەکــانم ئــەی نموونــەی مــەردی و ئازایــەتی!
بـەسیەتی بێـت و لـە دەس چـێ هـەر بـەفیـڕۆ ئـەم هـەلـە
ڕۆژی وا ئیـدی وە گـیری ناکـەوێ قـەد ئـەم گـەلـە
ئـەشـکی شـادی کیـژ و لاوی کـوردە ئـەترووسـکێتەوە
گوڵ بە بای خەندەی ئـەوان وەک کۆرپـە بـۆم ئـەشـنێتەوە
ڕەوتی شـیعرم وەزن و سـەربـەنـدی بـە دەسـتی خـۆم نییـە
وا لــە خــۆم ئاگــام بــڕاوە ســەیــرە هــەر خــۆی دێتــەوە

زۆر لـەمێـژە چـاوەڕێـی ئـەم سـاتە بـووین هاتۆتـە دی
لام وەکـــوو ئـــەفســـانە بـــوو بـــاوی ولاتم بێتـــەوە
زرمافی هەوڵ و خـوێنڕژانـە هـەروەکـوو بێکـەس کـوتی
«ڕۆژی هەوڵـە، هـەر بـە هـەوڵـە گـۆی هونـەر ئـەبرێتـەوە»
بەفر و سەرما ڕۆی، نەما و بـای وادەیـە و «هێـدی» دەڵـێ:
«بـەفـری بـەفرانبـارە بـێ بـای وەعـدە قـەت ناچێتـەوە»
چـــاوی پیســـی دوژمنـــان و دڵڕەشـــانی خـــوێنمـــژە
تیـــژە بـــۆ ئـــاژاوە یـــاران وەک تـــەشـــی دەخولێتـــەوە
گـــەر بهێڵـــن جـــارێ دی ئاواتـــەکانمـــان نـــەیتـــە دی
لالـــەزاری ویســـتی گـــەل وا زوو گـــران شـــین بێتـــەوە
گوێو لـە دەنگـی دایکـی دڵسـۆزی ولاتمـان بـێ بـە کـۆڕ
وا لـــە گوێچکـــەی تـــەکتـــەکـــی لاوانـــە دەزرینگێتـــەوە
لاوی کورد بێت و لە دەس چـێ هـەر بـەفیـڕۆ ئـەم هـەلـە
ڕۆژی وا ئیـــدی وە گـــیری ناکـــەوێ قـــەت ئـــەم گـــەلـــە
ئەی بە خوێن سووراوی خاکم! موژدە بێ خۆشی لە خۆت
ئێسـتە سـەربـەرزی و لـە پێـی لاوت پسـا زنجیر و کـۆت
سوورەگوڵ شین بوو لە سـەر گـۆڕی شـەهیـدانی گـەلـت
ئـەو جـەحێلانـەی کـە سـەریـان کـردە نـەورۆزانـە بـۆت
کێـوی «قـەنـدیل»! مـوژدە بـێ شـێرانی لانـت دەرپـەڕیـن
ئـەی «سـەفـین» ئازانـە مـزگێنی بـەرە بـۆ لای «گمـۆت»
مامـــە هـــێمن! هـــەســـتە ئیمـــڕۆ هاتـــە دی ئاواتـــەکـــەت
بەسیە ئەسرین بۆ پـەڕاکـەنـدە و لـە بـۆ ئـەڵـوەنـدی کـۆت

هەستە ئەی کاکی «پەشێو»! کوا جێگەتە مۆسکۆ و پڕاگ؟
چاوەڕێی شیعرێکی دیکەن خاک و خۆڵی بیرەکۆت
قانع! ئەمڕۆ ڕۆژی ئاواتی ئەتۆ بوو هاتە دی
پاکی ئازادی و بەجەرگین شیعر و هەست و تانوپۆت
«بووکی ئازادیم دەوێ و خوێنم خەنەس بۆ دەست و پێی»
ئێستە «ئاسۆ» بانگ دەکا کەمتر قوتابی شیعری خۆت
لاوی کورد بێت و لە دەست چێ هەر بەفیڕۆ ئەم هەلە
ڕۆژی وا ئیدی وە گیری ناکەوێ قەت ئەم گەلە

قەلادزێ- ٨٠/٦/٢٠

## دڵداری موحاڵ

تۆ پاکی وەکوو شەونمی سەر پەلکی گوڵاڵە
بە قسەی گەلی بێهەست مەکە، زۆریان قسە تاڵە
تۆ چاو لە شەمامەی سەری تەرزی یەخەکەت کە
هێشتاکوو نەگەیوە بە خودا دیومە کە کاڵە
چاوت پڕی مەعنا بە تەماشاتەوە دەدوێ
کێ تیغی زوبان تیژە لە حاندی تور و لاڵە
باوەڕ مەکە بەو شەخسە دەڵێ ئاشقی نەقسە
دڵداری لەگەڵ تۆ بە خودا عەینی کەماڵە
پاسپۆرتی ئەتۆ عیشقی منە هەڵفڕە زوو کە
ویزای نییە شاری دڵی من، موڵکی حەلاڵە
شەو چارشێوی وا داوە بە سەر ڕۆژی ئەویندا
ڕۆژووی من و تۆ بەو قسە ئاشقانە بەتاڵە
فایدەی نییە لەم عەسرە ئەوین چەشنی فەلاتوون
زۆر حەیفە وەکوو لاوی زەمان نەیکەیە گاڵە
ئاسۆ بە خودا خەونە ئەوەی تۆ بە خەیاڵیت
دڵداری لەگەڵ تیشکی گوڵئەستێرە موحاڵە

ساروقامیش- ۸۵/۷/۱۷

## تەخمیسی غەزەلی «دڵداری موحاڵ»

**پێنجخشتەکی خۆم لە سەر شیعری خۆم**

ئـازیز وەرە گـویٚ بگـرە لـە ئـەم سـیحری حـەڵاڵـە
تـەشـبیهی گوڵـی ڕووتـە دەڵـێی ئـاوی زوڵاڵـە
خـۆی جوانـە چ دەربـەستی بـە ئـارایش و خاڵـە؟
تۆ پـاکی وەکـوو شـەونمـی سـەر پـەلکـی گوڵاڵـە
بە قسەی گەلی بیٚهەست مەکە، زۆریـان قسـە تاڵـە
جـارێکی گوڵـم باسـێکی ئـەو بـاغی گوڵـەت کـە
یـادێکی بـە دڵ لـەم خـەم و ئـازارەی ئـەمـەت کـە
جەرگی بەد و بەدخـا بـە وشـەی ئاشـقی لـەت کـە
تۆ چاو لە شەمامەی سەری تەرزی یەخـەکـەت کـە
هێشـتاکوو نـەگـەیـوە، بـە خـودا دیومـە کـە کاڵـە
ئەبرۆت کە دەڵێی مانگە وەدەر کەوتـووە لـە سـویٚ
بـەخـتی مـنی بێچـارە لـە دووریـت ئـەوە دەنـویٚ
زولفــت وەکــوو ڕێحانــە لــە بــاغی دڵــە دەڕویٚ
چــاوت بــڕی مــەعنــا بــە تــەماشــاتەوە دەدویٚ
کـیٚ تیغـی زوبـان تیـژە لـە حانـدی تـور و لاڵـە
سۆفی کە دەڵـیٚ مـەیکـە نـەزەر هـەر ئـەوە لـەقسـە
خـۆ گشـتیٚ دەکـا بـیٚ عـەمـەلی چاکـەیـیٚ بـە قسـە
دوژمــن بــە ئــەوینــداری و مۆســیقە وو ڕەقســە

## دەسنویژی شیعر

باوەڕ مەکە بەو شەخسە دەڵێ ئاشقی نەقسە
دڵداری لەگەڵ تۆ بە خودا عەینی کەماڵە
بەو ناز و قسەت عومرێ کە ڕۆیی قەرەبوو کە
جارێ گوڵەکەم چاوێ لە ئەو ژینە کە چووکە
خۆ من دڵەکەم بۆ گوڵی جوان عەینی هەلووکە
پاسپۆڕتی ئەتۆ عیشقی منە هەڵفڕە زوو کە
ویزای نییە شاری دڵی من، موڵکی حەلاڵە
لاوی هەموو ڕابورد و تەمەن خۆی لە کەمیندا
تێراو نەبوو ئەو ڕۆحە لە پاناوکی زەویندا
دڵمان هەموو پیر بوو لە چلەی حوققەیی دیندا
شەو چارشێوی وا داوە بە سەر ڕۆژی ئەویندا
ڕۆژووی من و تۆ بەم قسە ئاشقانە بەتاڵە
ئاشق ئەوەیە ترسی نەبێ قەت لە فەدابوون
دەسنوێژی بە فرمێسک و تەهارەت بە خەم و خوون
بگرێ و نەبێ ئەندێشی لە پرسیار و چەن و چوون
فایدەی نییە لەم عەسرە ئەوین چەشنی فەلاتوون
زۆر حەیفە وەکوو لاوی زەمان نەیکەیە گاڵە
تۆ یاری منی پیری، ئەگەرچی کە مناڵیت
گەیوی بە بلوغیت و کەچی ماوتەوە کاڵیت
پیاڵەی مەیی شیعرم قسەتە، حەیفە کە خاڵیت
«ئاسۆ» بە خودا خەونە ئەوەی تۆ بە خەیاڵیت
دڵداری لەگەڵ تیشکی گوڵئەستێرە موحاڵە

## پاییز

پـاییزە، وەرە سـەیـری چیـا کـە وەکـوو زێـڕە
دار چـەشـنی کـراس‌زەردی قـەراخ قـۆپی و لێـڕە
هـەر زەردە گـەڵای سـەد وەرەق و لاپـەڕ و دێـڕە
وەیخوێنـەوە، چـت داوە لـە ئـەم فـەلسـەفە گێـڕە
هێگـل بـە هـەمـوو هێـزەوە لـەم فـەلسـەفـە لاڵـە

بڕوانە لە یەک قەترە خوناوەی گوڵـی ڕەنـگ‌زەرد
فرمێسکە کە باریوە لە حەسـرەت خـەفـەت و دەرد
یـان بولبولـە گریـاوە لـە بـەر تـۆفی هـەوای سـەرد
یان ئەسری منە بۆ خـەمـی دووری گوڵـی بێگـەرد
قـــومری! وەرە لێکـــی دەوە، لـــەم حاڵـــە بناڵـــە!

بۆ ئەو کەسە هەستی هـەبـێ کـوا مـەتڵـەبی ڕەنگـە
عەشقت لە دڵا بـێ غـەم و دەرد عـەیبـەیـە، نـەنگـە
چاو قیبلە بێ، دڵ ڕێگە بێ، هەر جێ‌یـێ فـەڕەنگـە
ماسیلەیی نێـو بـەحـری ئـەویـن عـەیـنی نـەهـەنگـە
هەر ئێسکەڵـەیـی چـەشـنی تـەڵای خـالیس و قاڵـە

ئەو دارە کە ڕەنگ‌زەردە گەڵای ماوە یەک و دوو
جارجـار نـەفـەسـی ساردی بـە زریانـێ دەبـێ ڕوو
بـۆ تـافی جـەوانی نییـە وا مفتـە لـە دەس چـوو
دوایـین سـەمـەری عاشـقی هـەر زەردەیـە تـا بـوو
ڕیشـەی تـەڕی تـا مابـێ بـە ئومێـدی ویساڵـە

پــاییزە، وەرە زوقمــی بــەیــانی وەکــوو زێــوە
وەک ڕەنگی ئەمن زەرد بووە هەرچی کەژ و کێوە
تــۆ خــوێنی خــەیاڵــی مــنی وا هــاتی لــە ڕێــوە
دەک ڕەببی بە خێر بێی بـە هـەنـار و بـەی و سـێوە
وا ئیـدی قـەباڵـەی غـەمـی بـێ دۆسـتی بـەتاڵـە

مــن ڕاســتە کــە وەرزی تــەمــەنم پــاییزەوارە
ئـەو کاتـە کـە دەمـدوێنی ئـەتـۆ وەرزی بـەهـارە
چـاوت کـە دەبیـنم دڵــی مـن بـەحـری وتـارە
شـیعرم بـە هـەمـوو شـێوەیـێ بـۆ دێ بـە قـەتـارە
سـابڵاخ و سـنەت شـێت بـووە، بۆکـانی موحاڵـە

تا تۆم هـەبـێ ماتـەم چییـە حـەددی کـە بڵـێ هـەم
دەستم بدە دەستی کە لە دەست مەینەتی خـەسـتەم
لەم ژینە کە وەک ژانە بە غەیـرەز غـەم و وەرهـەم
سـەرمایـە نییـە بۆیـە کـەوا کـۆن بـووە بـەرهـەم
لـەم کۆنـە دنـێ کـەنگـێ دەمـی تـازە خـەیاڵـە

قوربـانی غـەمـت بم کـە مـنی خسـتەوە پـەرواز
حـەیـرانی لـەبـت بم کـە مـنی خسـتە سـەر ئـاواز
هـەرچـەنـدە کـە پـاییزە مـەلی دڵ بـووم بـێنـاز
تۆم دیـوە مـەلی تـەبعـی دڵـم کـەیفـی بـوون ساز
ئاسۆت بە فیدای خاڵ بێ ئـەتـۆ پێـی مـەڵـێ خاڵـە

بۆکان- گەلاڕێزانی ٨١

## لە دوای یار

لە کووچەی سەروی بێتۆیی ئەنێم هەنگاوی کوێرانە
لە پاش تۆ چاوەکەی چاوم دەڵێی ئەم شارە وێرانە
ئەتۆ ئێستا لە خاکی هەندەرانی، باشە ئازادی
ئەمن چۆن هەڵبکەم بێ تۆ، لە نێو ئەم پۆلە کوێرانە؟
مەلێکی کۆچەری بووی چوویتە کوێستان بەختەکەی «ئاسۆ»
نەبوو هێلانەیەک بۆ تۆ لە نێو ئەم کاولە ئێرانە!
تەواری سەر چیای کورد بووی فڕیت بۆ ئەوپەڕی دونیا
مەترسێ، ڕووڕەشە ڕێوی ئەویش هەر لانی شێرانە
بەڵام گیانە ئەمن کوردم، بە ژینی سەر چیا زیندووم
کە پیریش بم بەبێ تۆیی دەکەم ژینی دلێرانە
ئەتۆ بووکی خەیاڵی شیعری «ئاسۆ»ی، تاو لە دڵتایە
منم هێشتا بە تاریکی دڵم گەشبینە لێرانە
هەتا نووری هومێدی ئاشقانەت شک بەرم شەرتە
نەبەز بم گیانە ڕاوەستم لە سەر ژینی بوێرانە
مەترسێ، ڕوونە «ئاسۆ»کەت، کەمێ سەبرت هەبێ چاوم!
لەمێژە کورد دەڵێ: هەر کەس لە سەر سەبرە لە خێرانە

بۆکان_ ۸۵/۱۰/۲۱

## خەرمانە

ئـەو زولـف و قـژە جوانـە وا پـەخـش و پـەرێشـانە
چاوی بەدی لـێ دوور بـێ، خـەرمانـەیـە چـەن جوانـە!
ڕووت مانگی شەوی چاردە، ئەو هەورە کە دای دەورە
تێکـەڵ بـە هـەناسـەی مـن، بـۆی بوونـەتـە خـەرمانـە
تـۆ تـاوی دڵـی «ئاسـۆ»ی، دەی دەرکـەوە شـەو ڕۆیـی
تـا بـزانی لـە خێڵـی شـەو چـۆن شـامی غـەریبانـە
ئـەی ئاسـکی سڵـم بـۆچ وا دەمبـینی دەبی ون لـێم
یـان بـەفـری دەترسـێی تـۆ لـەم تیشـکی نیگاهانـە
حاڵـیم لـە بـزەی لێـوت دەخوێنمـەوە خـەتـتی چـاو
لـەم مـەکتـەبـەدا پـیرم هـەرچـەنـدە کـە حـەو خانـە
ڕووم تێکە هەتـا کـەنگـێ ئـەم شـەرمـە لـە بـەینا بـێ؟
بـۆ تۆیـە ئـەگـەر وێڵـم چـەشـنی مـەلی بـێلانـە
دیـواری خـدەی کۆنـە بـەربـەنـدی ئـەویـنی مـە
ڕووخـانی بـە سـێلاوی خـوێنی دڵـە، هاسـانە!
ئـەم خـەڵـکە لـەمێـژ ساڵـە خـوێنی دڵـە شـەربـەتیـان
سـەربـەنـدی مـەقامـات و شـیعریش خـەمـی یارانـە
وەک زوڵفی ڕەشت شـەوگـار ڕۆژی گـەلی داپۆشـی
بـێخـەم بـە، بـە چـاوی تـۆ شـەو ڕۆژی لـە پاشـانە
ئەی تیشکی ئـەویـنی مـن! ڕوونی کـەوە «ئاسـۆ» کـەت
ڕایماڵـە بـە یـەک خـەنـدە هـەوری تـەشـەر و تانـە

مهاباد_ ٧٢/٨/١٥

# ڕێگا

پـــەری شـــیعرم دەمێکـــە لـــێ نـــەبانـــە
پـەپوولـەی هـەستی شـیعریم بـێنیشـانە
لەگەڵ ئەستێرە بۆ جێژوانی گـوڵ چووم
بـەڵام گـوڵ سیس و ژاکـاوی خـەزانـە
بــە تــاقیم کــردەوە بــەرمــاڵ و بــادە
هەموو یەک ڕێن و ڕێـی مـەنزڵ گرانـە
فیـدای ڕێگـەی ئـەویـنی ڕاسـتەقینـەم
کە هەم وەک پردە، هەم وەک نەردیوانە
دەزانــن ئـەوجـی زانـین کامـە دەرسـە؟
بـەرەو لووتکـەی حـەقیقـەت هـەڵکشـانە
وەرە و تـۆ ڕابـەری ئـەم ڕێگـەیـەم بـە
کـــە ڕێگایـــان تـــەنیـــوە داو و دانـــە
ئـەمـن ڕێبـواری ڕێگـەی بـاغی سـینەم
ئـــەوێ پـــێموا بـــەهـــەشـــتی عاشـــقانە
پەنای من هەر ئـەوێ و شـیعر و خـەیاڵـە
لە دەست دەردی گەل و جەوری زەمانـە
بـــــە «ئاســــــۆ» ناکشـــــێ دەردی وڵاتی
کـە ناڵــەی چووکـەیـان هـاواری نانـە

بۆکان ـ ٧٥/٩/٧

به پیریـت داوه پـێم ماچـێ لـه ئـەو دوو لێـوه هـەنگوینـه
بـــه لاویشـــم نـــەزانیبـــوو مـــەزەی مـــاچ هێنـــده شـــیرینه
هەتـا ئاشـق نـەبـووم گیانـه هـەمـوو ڕۆژێکـی دەتدیـتم
ئـــەگـــەر پێـــت خۆشـــه بمناســـی وەره ئێســـتاکه بمبینـــه
شـەهیـدی دەردی دڵ بـووم و لـه فرمێسـکم بـەدەرنایـێ
بـەڵـێ بـاغی ژیـان وایـه دەمـێ سـووره، دەمـێ شـینه
لـــه تـــۆ دوور بم بـــەهـــارم پـــایزه، ڕۆژم شـــەوی تـــاره
که تۆم لابی چلـەی زستانەکـەم وەک فـەسڵـی هاوینـه
ئەگەر سۆفی دەکـا مـەنعـم کـه بـۆ چـم دڵ بـه تـۆ داوه
نـزا لـەو چـاوه بـۆ ناکـا کـه وەک پڕشـنگی پـەروینـه؟
دەڵێن حاجی به ماچی بـەردی ڕەش قـەت نـاگرێ ئـاور
ئەمن گوڵ ماچ بکەم بۆچی دەسووتێم؟ کەی ئەوه دینه؟
ئەگەر تۆ پاک و بێغەش بی، خودا بۆچت دەسووتێنێ؟
ئـەوینـداری چ دەربـەسـتی شـەڕ و تـەحیـات و ئامینـه؟
مەڵێن «ئاسۆ» له سـەر ڕێ لاچـووه، نـا، نـا، خـودا دیـاره
مـــەبـــەســـتی دیـــن و ئـــایینیش لـــه ئاکامـــا خودادینـــه

بۆکان_ ۸۵/۵/۱۹

## جوابی ئاسۆ بۆ ڕاوچی[1]

بــرام «ڕاوچــی» خــەیاڵــت ئێســتە هۆبــەی ســەوزی هــەڵــداوە
خــەیاتــەی تــای خــەیاڵــی تــۆ هــەمیشــە کــرژە، کــەی خــاوە؟
دەڵــێن مزگــەوت بــڕووخێ جێگــە مێحــرابی دەمێنــێ هــەر
ئــەوەی «ڕاوچــی» بــە یــادی دایمــە شــادە، دیــارە هــەر ڕاوە

1) لە وڵامی شیعری مەلا کەریم ڕاوچی (سارده کویستانی)دا نووسراوە:

بۆ برام مامۆستا ئاسۆ

لـە ئاسـۆ تێگـەیـیم هێشـتا بـەیـانم بـێبـزە و تـاوە
پەپوولەی تـەبعـی سـڕ تـەنها لـە ئاواتی بـەجـێ مـاوە
لە ژێر چارشێوی ڕەش بەندە هەوێنی شیعر و هەڵبەستم
مەبەستم لێ ونە، هەستم نەخۆشە، خۆی لـە جـێ نـاوە
دڵم توورەی ڕەشی چارشێوە وا شـارم بـەجـێ هێشـتی
لـە دێهـاتم پـەری شـیعرم ئـەویـنی خـۆی بـەوێ داوە
گوڵی دوێنێ گلەی ماچی لە من بوو، سەیرە ئەوڕۆکە
گوڵی ماچ و گەمەی نازی لە سازی پـووز و پـێ داوە
لـە جێـژوانی خـەیاڵـمدا بـەرۆکـی دامـە دەس جوانـێ
بـە گیـانی تـۆ بـرا «ئاسـۆ» خـەیاڵـی خـۆم دەوێ نـاوە
دەزانم کـۆڕی تـۆ کـۆڕی ئـەدیبانـە لـە شـاریدا
دەڵـێی شـاعیر لـە دێهاتـا بـەبـێ کـۆڕی ئـەدەب مـاوە
ئـەتـۆ کـۆڕی «عـورووز» و قافیـەی قاقـڕ دەسـازێنی
بەلا «ڕاوچی» لە دێ کۆڕی بە سێوی کـاڵ و بـێ داوە

ترکاشه‌ـ ٧٣/١١/١٤

## دەسنویژی شیعر

لــە «ئاســۆ» ون بــووی بــەینێکــە، چارشــێو تــەبعــی تارانــدی
لـــە ئاوێنـــەی جـــەماڵـــی جـــوانی لادێ ڕووت وەدەر نـــاوە
بــرام حــەقتــە، بــە یــەزدان، تــۆ دەزانی جــوان و ناحــەز چــین
حــەشــار قــەد نــادرێ جــوانی، ئــەگــەر هــەورە، ئــەگــەر ســاوە
وەڕەز بــووم گیانــەکــەم ئــەمنــیش لــە ژیــنی تــاڵ و شــیعری کــاڵ
لـە «شـار» و «گرمـە» وو «هـاژە» و «سـەف» و «کـۆپین» و «ئـاژاوە»
ئــەگــەر مــن لێــرە ســەرگــەرمــی «عــەرووز» و قافیــەی شــیعرم
لـەوێ تـۆ ڕاوی «بـۆرچین»ت هـەیـە! «چـی تـرت ئـەوێ بـاوە؟»
لــە مــەیخانــەی تــەرەبنۆشــان هــەتــا ســاقی مــەیــی مابــێ
ئــەوەی «عــەشــقی» لــە دڵــدا بــێ ســەری هــەر مــەســتە تــا مــاوە
ئــەگــەر وەک دارە تــەنیاکــەی کــەلی «ئــەڵــقەبــری» تــەنیــا بی
پـــڕە دەوروبـــەرت تـــاکوو دڵـــت پـــڕ تـــین و پـــڕ تـــاوە
فیـــدای بـــەزم و بیســـاتی ئـــەهلـــی دڵ بم چـــون لـــەوێ دایم
مـــەلا و ســـۆفی و بـــەگ و شـــێخی لـــە کـــاتی پیرییـــا لاوە
یــەقــین حــەق هــەر بــەوانــە، چونکــە ئاکــامی ژیــان لــەم لا
بگاتــە عــەڕشــی ئــەعــلا پایــەکــەت، بــەش هــەر گــەزێ جــاوە
ئــەگــەر خوســرەو هــەبــووی جــامی جیهــانبــین، خــۆ دڵــی شــاعیر
وەکـــوو جـــامی جیهـــانبینـــە، کـــە ئاوێنـــەی قســـەی چـــاوە
بــەڵــێ مــن هــەروەهــا «ئاســۆ»ی فیــدایی تــەبعــی ڕوونی تــۆم
لـــەســـەر هێڵـــی غـــولامی ئـــەهلـــی دڵ ڕووم وەرنـــەگێـــڕاوە

ئاسۆ_ ٧٣/١٢/١٧

## محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)

ئەگەرچی کاتی نەورۆزە کەژ و کێو پاکی ڕازاوە
شەپۆلی ئاگری شەڕ دێ جیهان پڕ بوو لە ئاژاوە
بەهارە و گوڵ، کچە و جوانی، هەوارە و غونچەیە و باران
هەموو کۆڕن کەچی هەر دڵ لەبەر ئەم حاڵە گیراوە
چلۆن خۆش بێ دڵم ئاخر تەمەن دەڕوا و غەم و شەڕ دێ
کەچی بەم حاڵە غەمبارەش دڵم هەر گەرمە تا ماوە
کە ڕادەخوشێ بە نێو دڵدا تروسکەی چاوی ئەستێرە
لە سەحرای سینەکەی مندا دەڵێی مەحشەر هەڵستاوە
لە گرمەی هەوری بارانڕێژ زراوی کانییەکان تۆقی
کەچی لەولای ولاتی من کرێوەی شەڕ پەڵەی داوە
ئەوا چەندین سەری ساڵە گەلی من ئاگری نەورۆز
لە ماڵی وەردەبێ لە جیات گڕی نەورۆزەکەی کاوە
بەلام من دڵنیام ڕۆژێ بەهاری ئێمە هەر دادێ
دەبینین داری سەربەستی گەلی ئێمەش گوڵی داوە
لە «ئاسۆ» سەر وەدەر دێنێ هەتاوی ڕوونی ڕۆژی مەش
شەوی ڕەش هەرچی توولی بێ سەرەنجامی بزەی تاوە

بۆکان- ٨٢/١/٤

# خەون

خەوێکم دی، لە خەونمدا لە لووتم خوێن دەچۆڕاوە
بەیانی غەم دڵی گرتم، بەیانم بوو بە گێژاوە
بە تەعبیری بنوسیرین دەبێ ماڵی حەرامی بێ
خودا بۆ خۆی دەزانی من حەلاڵیشم نەبەشراوە
کەچی خەو بێسەبەب نابێ، ئەوەی وا قیبلە بوو بۆ من
وەفای بۆم بۆتە قاچاخی دەڵێی هەر هیچ نەقەوماوە
لەبەر ئەو دەفتەرم پڕپڕ لە شیعری پاک و بێغەش کرد
ئەگەرچی زادی ئەو پاکە، لە سەر ئەو هێڵە لایداوە
منم تەنیا لە کۆڕی ئاشقاندا سووک و ڕیسوا بووم
منم شووشەی ئەویندارییم وەکوو ئاوێنە چڕژاوە
وەفاداری فەقەت ئیسمێکە یەکجار بێموسەممایە
کراسی عاتیفە تا سەر بە بالای کەس نەدووراوە
دڵ و دڵداری ئەوڕۆکە هەوەسبازی و پلە و شوغڵە
ئەوەی ئەشقی لە دڵدا بێ سەراپا ژینی دۆڕاوە
ئەدەب پوولێکی بێ قەدرە، دەڵێی هی دەوڵەتی کۆنە
ئەوەی ئەهلی قسەی دڵ بێ دەڵێی ئاومالکی لافاوە
وەکوو «ئاسۆ» لە نێو کۆڕی ئەدیبانا وەلا دەخرێ
جەهالانگایە دانیشگا و بە شۆخی کالجی ناوە

مهاباد ـ ٨٥/٦/٢١

بــە زاری زار ئــەدرکێنــێ ئــەوەی دڵ بــۆی پــەشــۆکاوە
دەلاقــەی ڕۆشــنی نێــو دڵ لــە لای ئــەهلــی نــەزەر چــاوە
ئەوەندەم تـیری موژگـان لـێ دراوە خۆشـە بـووم؛ ئـەممـا
نیگای چـاوی خـەواڵـووی تـۆ دەڵـێی شـاماری بـێ ئـاوە
مـەگـەر فریـام کـەوێ نـووکی زمـانی خامـە بـۆ شـیعرێ
دەنـا جۆگـەی تـەڕی هـەسـتم دەڵـێی کـارێزی وشـکاوە
پــەریشــانی مــەکــە زولفــی خــەیــاڵاتی دڵــی کــەیلــم
ئەوان خۆ زولفی هـەوریشـمی ئـەتـۆ نـین تـا بڵـێی خـاوە
ئەتۆ ڕووت وەک پەڵەی بەفری دەمەو هاوینی سەر شاخە
بە ئاهی ساردی من هیچ نابـێ ئـادەی ڕوو بکـە بـەم لاوە!
نەچی تۆش هەڵفڕێنی بولبولی تـەبعـم لـە سـەر غونچـەت
سەری خۆی هەڵگرێ، شێت حەستەمە قەت بێتـەوە دواوە
شنەی بـۆنخۆشـی کـازیوەش کـەمـێ فێنکـایی نـادا پـێم
پەپوولەی ئارەزوو و خۆزیام ئـەوەنـد سـەربـاڵـی سـووتاوە
کەچی تا شک بەرم «ئاسۆ»یێ ڕوون هەروا لە سەر زەوقم
هومێـد و کـۆڵنـەدانـە خـەتـتی ڕێگـای تـۆرەمـەی کـاوە

بۆکان- ٧٦/٦/١

## باوێشکی بولبول

بەهارە و فەسڵی لالە و سوێسنە و سەحرا و کەژ و ئاوە
ئەوەند بێشەوقە گوڵ، بولبول ئەدا باوێشک و داماوە
نییە هاواڵ و هاوڕێیەک بپرسێ لێم هەواڵێکی
خەیاتەی هەستی دڵداریم دەمێ کرژە، دەمێ خاوە
دەڵێی گۆمیلکەیە چاوانەکەی چاوانم ئێستاکە
ئەوەند «ئاسۆ»ی هومێدم لێڵە هەر وەک ئاوی سەرچاوە
زنەی بەر بەفری قەد کوێستانی ئاواتم خوڕەی نایە
بەجێی بەفراوەکەی خوێنی دڵی کوێستانچی تێزاوە
بزەی لێوی هەڵاڵەش نابزێوێ هەستی خنکاوم
لەبەر دووری دیاری لالەڕوویان دڵ پەشۆکاوە
نە بولبول نەشئەکەی جارانی هەن تاکوو ورینگەی بێ
نە گوڵ خرمەی هەیاسەی وەک بەهاری پێشتری ماوە
کەچی ئەی بۆچ بە یادی چاوەکانت شارەگی شیعرم
وەکوو لالەی ترۆپکی شاخەکانی کورد هەڵیداوە؟
بە قوربانی نیگای چاوێکی تۆ بێ سەد بەهاری وا
بەهاری چی لە کاتێکا کە قومری بەندی قالاوە؟
ئەوەی شەرتی نەسیمی نەوبەهاری بێ بەجێ نایە
تەنانەت تووی گەزیزەش هەر لە جێی سالانی فەوتاوە
وەرە «ئاسۆ» هومێدم ڕوون کەوە ئەی ڕۆحی بارانە
هەتا شەتڵی هومێدی من لە بێئاوی نەخنکاوە

سەقز- ٧٦/١/٨

ئەو گـریٚ و گۆڵـەی شـریتی ژیـن، ئـەویـن دەیکاتـەوە
ئـاوی ئـەشـقە وا لکـەی شووشـەی دڵـت دەشـواتەوە
ئـەم ژیانـە چـەشـنی پـیٚش‌بڕکێیـە بـۆ پێشـکەوتنـە
بـا بـە ئـارامیش بـڕۆی هـەر ڕاسـتەڕیٚ دەیباتـەوە
خـەم وەکـوو دۆڵـپایە سـواری شـان دەبـیٚ و دانابـەزیٚ
بـیٚخـەمـی بـە! خـۆ دەنـا وەک خۆرەخـەم دەتخواتـەوە
لێی گەڕیٚ ڕوخساری ژینت گەردی مـەینـەت نـەیگـریٚ
بـا شـنەی بـای پێکـەنین سـەفحـەی دڵـت هـەڵـداتەوە
ئەو خەمەی وا تۆی لە خۆ گرتوون وەکوو بەفـری نسـار
هـەر بـە تیشـکی خـەنـدەیـیٚ دەتوێتـەوە و دەڕواتـەوە
نووری هیوای مەعنەوی گەر ڕوون بکا شەوگاری ژیـن
بـا هـەچـی بـەردی ڕەقـە باوێژنـە سـەر ڕێگاتـەوە
ئەی گەدای بەر دەرکی یار! شەرمیٚ مەکە لەو دەرکە دە
ئاقیبەت چـاو کاڵـیٚ هـەر دیٚ پـەنجـەرەت لـیٚ بکاتـەوە
تۆ سوهەیلی دەم بەیان بووی بـۆچی شـەوقـت لـیٚ بـڕا؟
خۆزگـە بـەو ڕۆژەی بڵـێن وا تـەیـری گـەرمـێن هاتـەوە
دڵـنیام ئـەو ڕۆژەیـە نامێنـیٚ خـەمی تاراوگـەیی
نامـەی ئـازادی گـەلم دیٚـنی بـە بـاڵ و پاتـەوە
ئەو دەمەی «ئاسۆ» بە تیشـکی ڕۆژی ڕووت تێـراو دەبـیٚ
هێنـدە ئـاوی تاڵـی ڕەنجـی ڕۆژهـەڵات ناخواتـەوە

بۆکان- ٨٦/٣/١٨

## دەسنوێژی شیعر

وەک دەڵێن یاران ئەوا نەورۆزی جاران هاتەوە
بەفری دووری بۆتە ئاو، ژەنگی دڵ دەشواتەوە
ئادەی ئەو پەردەی وەلا دەن، دەنگی سێروو دێ دەڵێی
لێو لە سەر شمشاڵی لێوە بینی ماچ دەخواتەوە
هەر بەتەنیا من لە نێو دەریای غەمتدا گێژ و خول
مات و بەستەزمان دەڵێی خەونی شیعر دەمباتەوە
کەی وەکوو ئەستێرە دەخوشێی، ڕوون دەکەی ئاسمانی من؟
با نەڕووشێ خەڵوەتی دڵ بەم هەمووو ئاواتەوە
دەردی دووریت کوشتمی کەی وەک مەلی گەرمێن گوڵم
نامەی ئازادی گەلم دێنی بە باڵ و پاتەوە؟
تا بە یادی خاڵەکەی لێوت لە خاڵوان وەرگەڕێم
دێم بەجێی بێڵم سەرم ماسیوە بەم سەوداتەوە
کێ وەکوو «ئاسۆ» غەریبی نیشتمانی خۆیەتی؟
قوڵفی زولفی ئەم گەلەم دنیا لە مل ناکاتەوە

بۆکان- بەهاری ٨٠

## تاسەبار

ئۆخەی ئەمجاریش نەمردم خۆم بە زولفت بەستەوە!
تاسەبارت بووم؛ کەچی تۆم دی بە چاوی مەستەوە
خۆش بە حاڵم وا هەمیسان تۆم لە نێزیک دیتەوە
لێوی ئاڵت جامێ بادەی ڕشتە نێو هەڵبەستەوە
چاوەکەم بۆ خۆت دەزانی حاڵەکەم لەم شارەدا
وا لە نێو شاری گوڵان، چەپکێ گوڵێ دیم بەستەوە
دێم بە تۆی پێشکەش بکەم لەرز و تەب و ترس ئەمگرێ
نەک گوڵی بگرینەوە تۆ مەیگرە بەو دەستەوە
لێی گەڕێ با هەر بە ڕۆح بۆنی وڵاتمان هەڵمژین
جا بە کار چی دێ لەگەڵ ژینی وەها ژێردەستەوە؟
گەورەیی و ژێردەستەیی وەک یەکترن لەم عەسرەدا
سەر، بەرەوژێرە، لە بن ژێردەستی حوکمی پەستەوە
هێند تراوە مەیلی یاران و عەزیزانی وڵات
تۆ مەهێڵە وشکەوە بم من بە هەستی خەستەوە
تۆ پەریلەی دوور وڵاتی و من لەبەر پێتدا گەدام
خۆم بە شای دنیا دەزانم بێژی «ئاسۆ» هەستەوە

بۆکان- ۷۷/۱۲/۲

## باغی گوڵ

ناحەقت ناگرم کە دەرکەت بۆچی قەت ناکرێتەوە
سینەکەت بەفرە بە هەڵمی یەک نیگا دەتوێتەوە
هەر نیگاییکت کە هەڵدەفڕێ لە چاوی وەک هەڵۆ
چۆلەکەی دڵ دەرکی شیعرێکی لە ڕوو دەکرێتەوە
چاوەکەم! نەیکەی دەری کەی ئەو دڵەی ئاشق بە خۆت
ئەو مەلەی تۆرا لە هێلانەی موحاڵە بێتەوە!
بای خەیاڵم دوور لە ڕووت دەخزێ لە سەر ڕوخسارەکەت
جا مەگەر بیکەم بە خاک و بیخەمە ژێر پێتەوە
دەک سەرم قوربانی ئەو خاکەی ئەتۆی پەروەردە کرد!
هیچ مەترسێ باوی ئازادی گەلی مەش دێتەوە
هێندە سەخت و ڕژدە ڕێگای باغی ئازادی گەلم
باسی جوانی تۆ نەبێ ئەم ڕێگە قەت نابڕێتەوە
لێم گەڕێ تاوێ لە باغی سینەکەتدا سەیر بکەم
سەیری باغی گوڵ، دڵی غەمگین دەلاوێنێتەوە
من زمانی گوڵ دەزانم با خەزانیش بێ تەمەن
تیغی دڕکە، زامی کۆنی کوردی پێ دەکولێتەوە

بۆکان_ ١٣٨٥/٢/٢٢

(...)

تـاکوو چـاوی تێگـەیـین هێنـدێ پتـر گـەش بۆتـەوە
لـــەم ولاتـــە باڵـــی شـــینی ڕاســـتی ڕەش بۆتـــەوە
ساڵـی سـالان گـەر درۆ چارشـێوێ تـۆڕینی هـەبـوو
خـۆ بـە ناشـوکری نـەبـێ ئێستا لـەوەنـدەش بۆتـەوە
پێکـەنـین پـاکی لـە بـن چارشـێوی چـاوەڕوانییـان
ئاشـی گریـە و پێکـەنـین ئـەورۆ لـە نـۆڕەش بۆتـەوە
چۆنە گوڵ ناپشکوێ و هێند دوورە بەستێنی بـەهـار؟
خۆشە ماڵ ئێستا لە جەولەی وەرزی سێشەش بۆتەوە!
بـۆچی بابـادەم دەبـێ خوێنـاو لـە چـاوانی نـەیـێ
وا دەبینێ ملـکەکـەی دیسـان بـە دوو بـەش بۆتـەوە؟
کرمی ئەندێشەی پڕ و پووچ کەوتە مەزرای پێکەنـین
بۆیـە کۆرپـەی یـەکیـەتی ئێسـتا لـە بـاوەش بۆتـەوە
هـەڵـفڕی کـۆتری ئـەویـن، داڵـی درۆ مـەیدانییـە
سافی شووشەی دڵ هەمیسان پڕ غەل و غەش بۆتـەوە
گەر لە بۆ باران تەمـی کـەللەی چیـا دەبـووە هـەوێـن
هەوری بارشتی نەشەی گـەل لـەم هـەوێنـەش بۆتـەوە
لاوی کورد هەستن! لە «ئاسۆ»تان کـەوێ وشـیار بـن!
لاچووە بەفـری چلـە، چـاو کـەن نسـار ڕەش بۆتـەوە

بۆکان_ ٧٧/١٠/٢٠

## ئاوارە

کــێ دەزانــێ بــۆچی وێڵــم مــن بــە لادێ و شــارەوە؟
بــۆ هــەدادانم نییــە بــەم حاڵــەتــە غــەمبــارەوە؟
کێ دەزانێ چۆن لە دەرس و دەور و مەکتەب بووم وەڕەز؟
لــەو عــەزابــەی دیم بــە دەســتی تــاقمی هوشــیارەوە
خۆزگــە دەتــزانی کــە چــەنــدەم دڵ پــڕە لــەم حاڵــەتــەم
دەست وەها کورت و کەچی خورماش بە نووکی دارەوە
تــا بــزانی چــۆن لــە شــەتــڕەنجــی ژیانــدا مــات و کــش
بــێ کــەس و جــێ، کــەوتــووم بــە شــوێن کــڵاوی لارەوە
وەک گوڵــینک بــۆ گــەردنی نۆبــووکی ئــاوات و حــەزم
تــەرمــی شــۆڕبووی چــوارچرای دڵــمە بــە ســەر سێدارەوە
جــا لــە جــێیــێ هــاوەڵانم یــەک بــە یــەک لــێم بوونــە دژ
خۆزگــە بــەو تــیرە کــە دەخــرێ دایمــە لای ئــەغیــارەوە
وەزنی شیعرم سووک و بێتین، حەنجەرەی ئەشقم گــڕە
ســاردە بــا، بــەســتوویەتی پــەنجــەم بــە ســیمی تــارەوە
جا مەگەر تــەنهــا وەســەر خــۆم کــەم کــەمــێ لــەو خۆڵــە وا
بــای شــەمــاڵ جارجــارە بــۆم دێنــێ لــە کووچــەی یــارەوە
تــا نــەچرپــێ ڕازەکــەت ئــەورۆ بــە گــوێی نامــەحــرەمــا
شــەو لــە تــۆی شــیعرێکی پــڕ هیــوای ســبەی بیشــارەوە
هیچ مەترســێ، ڕادەبــووڕێ وەرزی ســەرمــا و بــەســتەڵــەک
تــاو لــە «ئاســۆ» دێتــە دەر بــەو تیشــکی زێــڕین کــارەوە

مهاباد ـ ٧١/٨/٣٠

هەستی ژاری ماری هێشتا دیارە بەم ڕووی شارەوە
شیرینی هەر ماوە هێشتا بەم گ ژاری مارەوە
تۆزی غوربەت قەت لە کورد نانیشێ لەم خاکەی؛ بەڵام
تۆزی فەقر و ماتەمە نیشتوون بە سەر هەر دارەوە
ئێرە کابەی تێکڕماوە، کوا خەلیلێ ڕاپەڕێ؟
سازی کا چوار گۆشەیێ بەم جەرگە چوار پێنج پارەوە
هێند بە ترس و لەرزەوە هەستم دەنووسم دڵ دەڵێ
لێرە هەستی خۆت بڵێ، ئازادییە، مەیشارەوە
بازی خۆشبەختی لە سەر شانی مە زۆر کەم نیشتووە
ئێستە دەبیینم لە کووچەی شاری پڕ ئاوارەوە
دەنگ و خەت و بەرگ و لیباسی ئەگەر ئازادە بێ
تازە شیعرم ناکەویتە شوێن کڵاوی لارەوە
دەچمە هەر شوێنێ چریکەی دێ مەلی ئاشتی و سەفا
خوایە هەر بەرز بێ چریکەی ئەم مەلە بەو دارەوە
من بە دەنگی باڵی ئەو باڵندە هاتم وەک هەڵۆ
پێمە پەیغامی لە شاری زیرەک و سەردارەوە
ڕوونە «ئاسۆ»ی ئەم گەلە یاران! بدەن مزگێن بە یەک
دەم لە سەر لێوی ئەوینە و دەست بە سیمی تارەوە

قەڵادزێ ـ ٨٠/٦/١٧

## سێزده بەدەر

هات هەمیسان بۆم خەمێکی خـەسـت لـە کێـوی ژانـەوە
گـرتی بـەر تـاوێ کـە چـەسـپابوو بـە ڕووی ئاسمانـەوە
تاوی بێ‌هۆقرەش لە حەسرەت عارەقەی ساردی بـەخـوڕ
هاتـە سـەر ڕوخسـاری زەردی و بوونـە هـەڵـم و مانـەوە
هـەڵـمەکـەی گـرتی هـەناسـەی شـادمانی نـەوبـەهـار
چـاو بـەمۆڵـەق مـا لـە پشـتی پـەنجـەرەی تاوانـەوە
سـێزده وەرزی ژینـە مـن، وا دەربـەدەر مـاوم کـەچـی
شـوومی ئـەم بـەختـەم نـەشـۆراوە بـەدەم گریانـەوە
ئـەی تـەوژمـی هـەوری شـیعراوەر! لـە سـەرما لێبـەوە
بەسمە ئیـدی جـەزرەبـەت، قرچـام بـە دەس ئـەم ژانـەوە
تا بە کەی قاچاخی هەست و عـەشـق و شـەوق و عاتیفـە
هەڵـبقرچێ شـەم بـە یـادی سـوبحی زووی پـەروانـەوە؟
بـەسمـە توخـوا لـێم‌گـەڕێـن بـارانی سـەوزی چاوەکـان
تـا بـە کـەی هـەروا بـە یـادی خـەنـدەیـێ شـێتانەوە؟
تا بە کەی کۆرپەی نەشەی هەڵبەست و شیعرم چاوەڕێ؟
چاوڕێی چۆڕێ ژەکی خەسـت بـێ لـە مـەمکـی نانـەوە؟
سـێزده وەرزی ژینـە چـاوی نـەرگسـی هیـوام بـەکـوڵ
گل دەکـەن، سـوور بـوون بـە یـادی قـەتـرەیـێ بارانـەوە
ئیدی بۆ چـی بچمـە دەر خـۆم سـێزدەم و «ئاسـۆ»ی بـەڵا
لێم‌گەڕێن خـۆم ژیـر دەکـەم تـا هـەم بـە ئـەم شیعرانەوە

بۆکان_ ٧٥/١/١٣

## پێنجخشتەکی لە سەر غەزەلی سێزدەبەدەری ٧٥

هات بەهار و کێو و دار و گیای وڵات بووژانەوە
هەر جریوەی بولبولە و گەر دێ لە سەر شاخانەوە
ڕەنگە مەنگوڕ بم ئەمن پێم عەیب نەبێ بادانەوە
هات هەمیسان بۆم خەمێکی خەست لە کێوی ژانەوە
گرتی بەر تاوێ کە چەسپابوو بە ڕووی ئاسمانەوە

تاوی چی؟ بەم تاوە من پەنجەم دەبێ پێی سارد و سڕ
من بە هیوام تاو کەمێ پەنجەی دەسم بێنێتە گوڕ
بێکەسی و بێدەستەڵاتیم شیعری شادی کردووە قڕ
تاوی بێئۆقرەش لە حەیبەت ئارەقەی ساردی بەخوڕ
کەوتنە سەر ڕوخساری زەردی و بوونە هەڵم و مانەوە

ڕاستە وەرزی خاکەلێوە خۆشە بۆ تیپی تەیار
بۆ منی بێچارە فەرقی کوا هەیە ئاب و ئەیار؟
ئاهی سەردم بوو بە هەڵم و دیدی کردم تار و مار
هەڵمەکەی گرتی هەناسەی شادمانی نەوبەهار
چاو بە مۆلەق ما لە پشتی پەنجەرەی تاوانەوە

**دەسنویژی شیعر**

ئەو دەڵێ وا سێزدەیە و نەحسە، ئەمان بێ مەی نەچی
ساقی بێ پەیمانەیە و مەی خاڵییە و هەر مل کەچی
ماوە بۆ ئەمنی بەخت ڕەش، ئیدی دڵ خۆش کەم بە چی؟
سێزدە وەرزی ژینە من وا دەربەدەر ماوم کەچی
شوومی ئەم بەختەم نەشۆراوە بە دەم گریانەوە

یارێ دڵسۆزم هەیە هەر تاقە دڵخۆشیم بەوە
لەم شەوەی ئەنگوستەچاوە بۆ ڕچەم مانگەشەوە
ئەی تروسکەی نەوبەهارم! زەنگی دیکەش لێدەوە
ئەی تەوژمی هەوری (شیعراوەر) لە سەرما لێ بەوە
بەسمە ئیدی جەزرەبەت، قرچام بە دەست ئەم ژانەوە

من بەڵێ شیعرم هەتا بێ دەیپسێنم داوەکان
مووش سپی بێ خۆم دەهاوێمە هەرێمی لاوەکان
چاوی شینی یار دەبێتە ڕێبەری ڕووداوەکان
بەسمە ئیدی لێم گەڕێن، بارانی سەوزی چاوەکان!
تا بە کەی هەر وا بە یادی خەندەیێ شێتانەوە؟

هێندێ کەس پێی وایە شاعیر حەق نەوێژێ خایفە
زۆر لەمێژە نووری هیوای حەقپەرەستی زایفە
تا بە کەی قاچاخی بڕوا لای ڕەفیق و تایفە؟
تا بە کەی قاچاخی شیعر و هەست و ئەشق و عاتفە؟
هەڵبقرچێ دڵ بە یادی سوبحی زووی پەروانەوە؟

زۆر لــەمێــژە ڕێ دەپێــوم داخــەکــەم هــەر مــاوە ڕێ
هەرچی من پارێز دەکەم هەر پڕ لە دانە و داوە ڕێ
تا بە کەی لە جیەی قەناری دێڵی خوێڕی داوەڕێ؟
تا بە کەی کۆرپەی نەشەی هەڵبەست و شیعرم چاوەڕێ؟
چاوەڕێی چۆڕێ ژەکی خەست بێ لە مەمکی نانەوە

سـێزدە وەرزە مـن لـە ڕۆژی سـێزدەدا دەگـریم بـە دڵ
سێزدە وەرزە چەشنی بولبول مات بووم بۆ وەسڵی گوڵ
سـێزدە وەرزە شـادمانی لـێم ونـە وەک ئاسـکی سـڵ
سێزدە وەرزە چاوەکانی نەرگسی هیوام بە کوڵ
گـل دەکەن، سوور بوون بە یادی قەترەیی بارانەوە

شـار وەکـوو زیندانـە ئـەمما دەرکەکەی بۆم ئاوەڵا
کوانێ قۆچاخ خۆشترە تا حەوزە گەورە و سەر قەڵا؟
مـن کـە ئـاوا دەسبەسـەر مـاوم بـە یاسـای مامـەڵا
ئیدی بۆچی بچمە دەر، خۆم سێزدەم و «ئاسۆ»ی بەڵا؟
لێم گەڕێن خۆم ژیر دەکەم تا هەم بە ئەم شیعرانەوە

غزل: ٧٥/١/١٣
پێنجخشتەکی: ٨٦/١/١٣

## حەسرەت

داخەکەم ڕەمزی وەفاداری لە خەڵکی ون بووە!
لەم وڵاتە جوانەدا شووشەی موحیببەت کون بووە
من چەلان چاکم دەزانی وەسفی خەندەی پڕ ئەوین
ئێستە ناو ماڵی ئەوینم تار و بێ ڕۆچن بووە
سووری دەسرەی کیژی سەرچۆپی دەلەرزێنێ دڵم
داخەکەم پەردەی خەیاڵی عاشقیم چڵکن بووە!
شوشتوشۆریکی دەوێ ئەمما بە ئاونگی نەشە
چونکە ئێستا هەر غەمە و هۆگر بە ڕۆحی من بووە
ئەی گوڵی خەشخاشی چۆپی گر! بە تیشکی چاوتە
پەنجەرەی هەستی نەشەی ویستی دڵم ڕۆشن بووە
تێر تەماشا کە، مەترسێ، هەر بهاوێ تیری چاو
من دڵم زۆر جار لە شاییدا نیگائاژن بووە
شەرمی پێ ناوێ دەزانم سوورە سێوی ڕوومەتت
تیلەکۆ هەر تا بووە هەر جێی کچی شەرمن بووە
بۆیە «ئاسۆ» جوانپەرەستی بۆتە مایەی شیعرەکەی
چونکە چەن ڕۆژێ لە ژین شاگردی «مام هێمن» بووە

ساحێب- سەقز- پاییزی ١٣٧٦

## لە تاق وەسان

عیشـقی شـیرینە کـە فـەرهـادی بـە کۆکـەن کـردووە
زوڵمی خەسرەو هەستی شاپووری بـەبێ فـەن کـردووە
گـەر جـەزەی ئـاواتی بنیـادەم لـە خـەرمانـانی عیشـق
چاو بکەی، جا تێدە گەی کێ ئەو جەزەی شەن کردووە
کێوی بێستوون بەم هەمـوو کانیـاوە دە گـری بـۆ گـەلێ
بێکەسی، زۆر شێتی وەک فەرهـادی ئـەهـوەن کـردووە
لەنج و لاری کیـژە کـوردی خـەتـتی مێـژووی ئاشـقین
عیشـقی دڵـدار زۆر سـەری بێهـاوەڵـی تـەن کـردووە
فـەخـر و فاقـەی میللـەتی کـوردە لـە مێـژووی ئارییـا
کـان و سـەرچـاوەی شـەوی ئێـرانی ڕەوشـەن کـردوە
شـوێنەواری پـڕ لـە شـانازی بـەرەی پێشـووی مـەیـە
کرمـەشـانی هـەر وەکـوو پـاریس و لـەنـدەن کـردووە
ڕۆژی ڕووناکی گەلی مـەش وا لـە «ئاسـۆ» دەرکـەوت
تیشـکی شـانازی، ڕەشـی شـەوگـاری پـاوەن کـردووە
هـەر بـە تـەنیـا شـیعری «ئاسـۆ»یـە غـەریـب و بـێنـەوا
خۆی لەسەر سەربـانی شـیعری کوردیـان بـەن کـردووە

کرماشان- تاق وەسان- ٨٥/٨/٤

## تازیەداری

«بێوەفایی تۆم بە ڕۆژدا سەد کەڕەت بیر دێتەوە»
زامەکەی کاک ئەحمەدە لە دڵی منا دەکولێتەوە
سەد کەڕەت وەعدەت بە من دا جامێ ئاوم پێ بدەی
خاڵییە پەیمانەکەت، ئەو ئاوە کەی دەخورێتەوە؟
هێندە تامەزرۆی زرەی زەنگی ئەلۆیەکتم ئەگەر
هەر کەسێ دێ لێم بپرسێ، دڵ دەڵێ نا هەر ئەوە
چاوەکەم! من تازیەداریش بم دەبێ لوتفت نەبێ؟
کوانێ گەرمی گوفتەکانت؟ زەنگێ دیکەش لێدەوە!
سەد ئەوەندەی چاوەکانت شین و دەریاییم وەرە
قەت بە قەد من زولفەکەت ئاڵۆز نییە، بەریان دەوە!!
پیاو لە پەنجاش با بێ، جێی بێڵی سەغیرە چاوەکەم
شادی لێم تۆراوە توخوا تۆ وەرە و ئاشتمان کەوە
کێ بە قەد من شیعرەکەی گوڵزاری جوانی و سەوزییە؟
نەیگەزێ با شەختەیی ئەم کۆچبارە، ساقی! با دەوە
تێکە جامێ گەردی کۆچی باب و یاران گەییە سەر
تۆش برۆت دەرخە لە «ئاسۆ» با بڵێن مانگی نەوە

بۆکان_ ١٣٨٥/٩/٦

# ژیانەوە

چـاوەکـەم! هـەودای خـەیاڵـی عاشـقیم مـەپسـێنەوە
لێـی گـەڕێ بـا تـۆوی غونچـەی هـەڵـوەریـو بڕوێنـەوە
شووشـەیـی تـەنیـایی مـن ئاوێنـەیـە بـۆ عیشـقی تـۆ
خــۆ چ نابــێ خــۆت ببــینی جــارێ لــەو ئاوێنــەوە
پاییزە و دار و دەوەن ڕەنگ‌زەردە وەک کۆرپەی حەزم
چاوەڕێم ئەی خوایە کەنگێ تەیری گـەرمێن دێنـەوە؟
سەر لە سەر باڵی مەلی عیشق و ئـەویـن کـەن لاوەکـان
بـەو هـەناسـەی گـەرمـی عاشـق ئـەم تـەمـە بتوێنـەوە
کێ دڵی دێ نازی گوڵ ڕانەگـرێ وەک تـامی ئـەویـن
ئـەو دەمــەی وا گوڵــپەڕی بــۆ بولبــولان دەشــنێنەوە؟
کـێ هـەیـە گـەر حـەز لـە ئـاهی ئاشـقانەی دڵ نـەکـا
گـەرچـی ماڵـی دڵ لـە داخـاش بێتـە گـۆمی خوێنـەوە؟
هـۆ بـەژن داری هـەنـار و دیمـەنـت بـاغی ئـەویـن!
کـێ دەڵـێ پـیری هـەیـە؟ تـۆ ئـەمچـەلـەش بـەر بێنـەوە
جا دەبینی هەرچـی ئـەستێرەن لـە حـەیبـەت چاوی تـۆ
ڕوو لــە «ئاســۆ» تــا بــەیــان هــەڵــدێن و دەزریوێنــەوە

بۆکان_ ٧٧/٦/١١

## ڕەمزەیە

ڕەمـزی ئـەو چـاوە بـە مـن هـەڵـنایە
بـێبـەڵا بی تـەمـەشـا کـوا وایـە؟
مەیلەکەت ساردە ئەگەر، خۆ تەماشات
«تـەزووە، لـەرزە، مچورکـە، تایـە»
خاڵـەکـەت نوختـەیـەکـی پـڕ نـوورە
ڕۆشـنی قـەلـبی ئـەمـن لـەودایـە!
چی دەڵـێن خـەڵـکی دەبـا هـەر بیڵـێن
پـەنـد و مۆژگـاری لـە گوێمـا بایـە
وەک خەتی خامەیـی عـەشـقن لێـوت
کـە هـەزار هـەسـتی ئـەویـنی تیایـە
بـە فیـدای گـەرمـی دڵـی عاشـق بم
کـە دژی بـەسـتەڵـەک و سـەرمایـە
کێ گـەدای دەرکـی ئـەوینـداری بـێ
لـە قـەڵای مـەینـەتی ژینـدا شـایە
تـۆ هـەتـاوی بـە هـەور ناشـارێی
وەرە گـوێ بگـرە لـە ئـەم سـەودایـە
لە سـەرمدایـە خـەیاڵـی گوڵـی ڕووت
مـنی کـڕیاری بـەبـێ سـەرمایـە
من لە خاڵی ڕەشی تۆ بـۆم دەرکـەوت
دڵـی بـەفـریش ڕەشـی هـەر تێدایـە

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

حـەیفـە تـۆ بـەو جلـە بێگانـە وەبی
مـەڵـێ ئـەم بـیرە گـەلـێ سـاوایە
دامـەنی پـەلکـی گوڵاڵـەش بـدرووی
هێشـتە لـەو بـەژنـە لـەتیفـەت نایـە
شل دەکا هێـزی مـە پشـتوێندی شـلت
چـاو لـە دەسمـاڵ کـە دەڵـێی ئاڵایـە
من کە ئاڵای نەبوو قەت میللەتـەکـەم
پـەرچـەمـت بـۆ دڵـەکـەم سـوکنایە
چییـە «ئاسـۆ» بـەتـەمـای تـیرێ تـری؟
بـەزەییـت بـەو دڵـەتـا بـۆ نایـە؟

بۆکان- ٧٤/١٢/٣

## ژیلەمۆ

بـە چـاوی تـۆ قـەسـەم گیانـە ئـەوینـت هـەر لـە دڵـمایە!
نەسیحەت گەر لە بۆ خۆی کوت، نەسیحەت لای ئەمن بایە!
ئـەمـن ئـەمـڕۆ لـە موڵـکی عاشـقاندا «قـەیسـی» کـوردانم
فیـدای تـورکی دو چـاوت بم ئـەدی بـۆ نابیـە «لـەیلایـە»
هەزار خۆزگەم بە حاڵی خۆم کە بوومە مـەحـرەمـی ڕازت
بـە قوربـانی دو چـاوت بـێ هـەمـوو ژیـنی ئورووپایـە
پەپوولەی نیـوەسـووتی شـەمعـی ڕوخسـارت تـەماشـا کـە؟
بـە خـەنـدەی لێـوەکـەت بـووژاوە؛ حاڵـی ژیلـەمـۆ وایـە!!
نــە قاســد مــردووە چــاوم، نــە کاغــەز بۆتــە قاچــاخی
ئـەدی بـۆ ساڵـە جـارێکیش هـەواڵ و نامـەیـەک نایـە؟
ئەگـەر پێـت وایـە بـۆ سـوجدە لـە نێـو مزگـەوتی دڵ نـابم
بــە دەســتی خۆتــە ئــایینم دەڵــەی بێمــە کلیســایە
بەرەولای خـوای «کـەریم» بـەرزە بـەدایم دەسـتی «ئـامینم»
دڵــم ئیــدی لــە چاڵــی «بیــژەن»ایــە و تــازە دەرنایــە
هـەتـا هـەوری ئـەویـنی تـۆ دەکـا سـێبەر لـە سـەر «ئاسـۆ»
حـەرامـی بـێ بـە غـەیـری ئـەو لـە هـاوین سـێبەر و سـایە!

باغی میراوا ـ ٧٧/١٢/١٣

## بێژنگی هەڵە

کاری گەردوونە کە هەر ڕێیێ دەپێوم هەڵەیە
دەچمە سەر هەر کەژ و کێوێ گوڵەکانی تەڵەیە
نەبوو دابێژێ کەسێ تۆوی وەفاداری لە خاک؟
یا نە بێژنگی خەباتی گەلی من هەر هەڵەیە؟
من کە زەردەی سەری لێوانە گەشی باغی دڵم
چاو لە هەر لێوێ دەکەم باری وەکوو ڕێزەڵەیە
دەستی نێو باغی شەمامان شەتەکە و بێدەسەڵات
سینگی ئەم خاکە لهبۆ دەستی نەیار ئاوەڵەیە
سەردەمی کۆچی وەفادارییە، ڕاستی کەمە کەم
گۆڕغەریب کەوتووە حەق، وەرزی درۆ و تەشقەڵەیە
کێڵگەیان سیس و کز و زەردە هەموو دێم و بەراو
وەرە ئەی هەوری بەهاری، وەرە وادەی پەڵەیە
وەرە بیشۆوە لە ئەم خاکە تەمی دوورەبەشی
وەرە وشکی کە ڕەگی هەرچی بژار و کەڵەیە
ئەی بەر و باغی بەهارم! بە بزەی تۆوە دەژیم
تۆم نەبێ شووشەیی هیوا پڕی خەوش و خەڵەیە
چاو لە «ئاسۆ» کە دەکەی هێندە ورەم دەچتە سەرێ
هەرچی شمشێری جەفا بێ بە نەزەر تیخەڵەیە

بۆکان ـ ٧٥/٢/٣

## بۆمەیلی قەدیم

چاوی دڵ هەر چاوەڕێی نامە و خەتی جانانەیە
تەیری دڵ دەندووکی قفڵی داوی سەر بێ دانەیە
بەختە بارانی تەمێ دەڕژێتە سەر مەیلی قەدیم
شاری دڵ ئێستا تەڕ و پاراوی ئەم بارانەیە
فەسڵی هاوینە و لە مەزرای ڕۆحی من زستانە هەر
چون دەماغم بێ هەناسەی شەونمی ڕێحانەیە
ورد و خاشی بەردی نامەردی بووە باڵی خەیاڵ
تازە هیوای هەڵفڕینی، شەوخەوی هێلانەیە!
دڵ دەبیرستانی دەردە و کاسەیی سەبرم پڕە
خاڵییە پەیمانە، پێموا ئیشی ئەم پەیمانەیە
مەی نییە، ساقی نییە، ساغەر شکا، مەیخانە چۆڵ
سازی ئاهەنگی شەوان هاڕەی تفەنگی تانەیە
سووک و ڕیسوای شاری دڵ بووم و هەدادانم نییە
چ بکەم ئاخر خۆ دڵیشم لەو دڵە شێتانەیە!
تا نەبێتە بەر تەوانج و تەوس و گەپجاڕی کەسان
نایەتە جەزبەی شەوانە و عەشقی لا ئەفسانەیە
نیشتمانیش دەوری تەنراوە و دەڵێی زیندانە بۆم
سەیرە دڵ چۆن بەندی زوڵفی بەندی ئەم زیندانەیە
هیچ مەترسێ «ئاسۆ» لەم ئەحواڵە چون قانع دەڵێ:
«قوڕ بە سەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە»

بۆکان- ٧٢/٤/٩

## چاو

وەهـای گێـژ کـردم ئـەو چـاو و برۆیـە
بـــە هـــەر چێکـــت بشـــوبهێنم درۆیـــە
لە بـەر چـاوم لـە چـاوی چـاوەکـەی تـۆ
ئـەوەی بـەر چـاو نـەیـە چـاوی هـەڵـۆیە
وەرە سـەر بـانی چـاوم بـا نـەبـێ زیـز
کـە بانـە مـەسـکەن و جـێ خێڵـی تۆیـە
لـە «ئاربابـای» ئـەویـن‌دا هێنـدە بـەرزی
«سلـێمان‌بـەگ» لـە تـاوت ڕەنجـەڕۆیـە
فیـدای دەردی ئـەوینـت بم چ خۆشـە
وەکوو شـەهـدی لـەبـت تـامی گـەزۆیـە
گوتـت: «وشـیاری تانـەی بـێ‌دڵان بـە»
گوڵم عاشق لە کوێ ئاگـای لـە خۆیـە؟
نیگارکێش نەخشی تۆ کەنگێ دەکێشێ؟
ئـەگـەر ئـەو لافـە لێـدا پـێم دهۆیـە
ئـەتـۆ نـووری، دەبـێ بکشـێی بـە دڵـدا
وەسیلەی وان هەمـوو ڕەنـگ و پـەڕۆیـە
وەرە سەر چاوی دڵ، وێنـەت دەکێشـێ
گلێنـــەی چـــاوەکـــانم قـــاپی تۆیـــە

## دەسنوێژی شیعر

غەزەل وەک پارچەیێ بێقەدر و سووکە
ئـەوەنـدە بـەژنی تـۆ خـاوەن شـکۆیە
لە سـەد یـەک هـەستی «ئاسـۆ» نانوێنـێ
هەتا دەربەستی بـەیتی هـەشـت و نۆیـە

بورهان- ٧٥/٥/٢٠

## دەریای ئەوین تۆفانییە

سەردی مەیلی تۆیە وا نەورۆزەکەم زستانییە
ڕۆژی بەختی عاشقیشم وەک بروت قەترانییە
ئاگری عیشقت لە خرمانی خەیالم بەر بووە
بۆیە دەنکێ تۆوی سەبری بۆ نموونەش تیا نییە
ڕامەبووریێ وا بە لاما بێتەفاوەت، چاوەکەم!
چاو لە نالەی بولبولی دڵ! دڵڕەقی هێند چا نییە
ئەم هەناسەم ئاگرە، ئاگات لە خۆ بێ نەتگرێ
تۆ کە تافی عومرەکەت وا ناوەڕاستی جوانییە
دڵ لە بەردەرکی ئەوینت وەک گەدای مەیخانەیە
چاوەڕێی چۆڕێ شەڕابە، مەی نییە، سەهبا نییە
ئاوەڵا جارێ ببینێ دەرکی مەیخانەت دەڵێ!
ماڵی دڵ ئاوا، دەنا گوڵ هێندە دڵئاوا نییە
ناوەکەت وەک شەمعە بۆ من، خۆ منیش پەروانەوار
بۆ ویسالی شەمعی ڕوو، کەس هێندە بێپەروا نییە
شەو مەلی دڵ تا بەیانی هەر دەناڵێنێ و دەڵێ
گوڵ وەها دوور و گرانجان، عەینی سەرگەردانییە
دیدە وا گەوهەر دەڕێژێ و عەشقی تۆش کەشتی نەجات
پێی لە سەر دانێ، مەترسێ، دیدەیە دەریا نییە
وەک ئەمن کەم کەس دەزانێ شەرحی ڕەمزی عاشقی
وەک ئەمن کەس بۆ ویسالی شەمعی ڕوو شەیدا نییە

**دەسنوێژی شیعر**

سەد کەڕەت لۆمەم بکەن هەر دەرکەوانی عیشقی تۆم
گەر دەرم کەی دێمەوە، بێ تۆ دڵم بینا نییە
تۆ لە «ئاسۆ»ت هەر نەپرسی بۆ وەها بێدەنگ بووە
دەورەکەی سەختە گوڵم، دەریای ئەوین تۆفانییە

بۆکان- ٧٦/٣/٨

## محەمەد سەعید نەجاری (ئاسۆ)

سەرزەوی عیشق و ئـەویـن وەرزی خـەزانی بـۆ نییـە
شێتی ئەم شارۆچکەیە عـەودالـی دەشـت و کـۆ نییـە
زۆر نیگا تووی خۆشەویستی چاندە نێو مەزرای دڵـم
چاو دەکەم هیچیان پەیـامی وەک تـەماشـای تـۆ نییـە
هێندە پێ ویستی بە ڕێی عیشقا بچێ ئـەژنـۆی چـەمـا
تـازە پێـی زانی ئـەوێ پێویسـتی هـاتوچـۆ نییـە
هەر خەمێ بێ دەیچەمێنێ پشتی تاقەت، سـەیـرە پـێم
ئـەو خـەمـەی وا تاسـەباری تـۆم دەکـا بـێهـۆ نییـە
داوەتی شای خۆشەویستی وەک یەکە ڕۆینە و چەپی
دەسـتی گـەرمـی ئاشـنا بـێ قـاتی پـەنجـەی دۆ نییـە
شـیعری تـازە چـاوی تـۆ هـەر قاڵـبێ بـێ تـازەیـە
خۆ ئەوین شەرمی لە شیعری دوێنەکـە و ئـەوڕۆ نییـە
بـێنیگـای چـاوی ئـەتـۆ ڕەنگـی نییـە ئـاواتی مـن
کـەس بـەقـەد مـن بـۆ پـەیامـێ تـازە تامـەزرۆ نییـە
بێتو شیعرێ بـێ خـەیاڵـی تـەڕ بـە مـن نیسـبەت درێ
پاش لە مەرگیشـم بڵـێ ئـەو شـیعرە هـی «ئاسـۆ» نییـە

بۆکان / مهاباد ـ ٧٧/٨/٢

## پێکەنینی گوڵ

بێ سەبەب بولبول لە باغا شین و ناڵینی نییە
پێکەنینی گوڵ نەبێ قومری هەوای شینی نییە
لابە سۆفی ویشکەڵانیت چاو لە چاوی جوانێ کە
هەر کەسێ زەوقی نەبێ هەستی خودادینی نییە
کوشتەی ئەو چاوانە پێم‌وا لای خودا ڕزقی هەیە
وەک شەهیدی بێ‌نەوا یاسین و تەڵقینی نییە
چۆن لە شەوگاری ڕەشا ڕێ دەردەکا ئەو بێ‌کەسەی
گەر ترووسکەی نیونیگای چاوێکی شین شینی نییە؟!
دەرکی ناکا دەرسی عیشق و خۆشەویستی چاوەکەم
ئەو کەسەی لەم مەدرەسە تیکرار و تەمرینی نییە
تا نەڕووخێنێ بەڕاستی گەر کەسێ کۆشکی درۆ
زەمزەمەی بن لێو بە پووشێ؛ چونکە هەر دینی نییە
من پەپوولەی دەوری ڕووی تۆم چون گوڵاڵەی هەستمی
زۆرە گوڵ؛ ئەمما هەمووی هەر گەردی هەنگوینی نییە
کێ وەکوو «ئاسۆ» لە گوڵزارا تەوافی گوڵ دەکا؟
حەزرەتی گوڵ تا هەبێ، چاوی دڕوو بینی نییە

بۆکان- ٧٥/١٠/١٧

# گوڵە پاییزە

گوڵــە پــاییزە نــەشــەی وەرزی بــەهــارانی نییــە
لـە قـەراخ جۆگـەلـەیـە و ئـاو لـە کـەنـارانی نییـە
گـەرچـی پشـکووتووە ئـەمما بـە خـەزان پێدەکـەنێ
وەک ئـەمـن تـەنگـە دڵـی و بـانگی هـەزارانی نییـە
غونچـە وەک زەڕنـەقوتـە ڕوو لـە حـەوان بـۆ نمێ ئـاو
هـەوری وەرزی خـەفـەتـیش قـەتـرەیێ بـارانی نییـە
بـۆ لـە وەرزی غـەمـە پشـکووتووە غونچـەی دڵـەکـەم؟
لــەم هــەمــوو شــارە بــزەیـەک لــە هــەزارانی نییـە
سەروی سەرسەوزی خەیاڵ! داییمە هەر خۆزگە بە خۆت
چـون گـەڵات سـەوزە ئـەبـەد، زەردی لـە بـارانی نییـە
خـۆش بـە حاڵـی ئـەوە شـاری دڵـی ڕەنگـاوە بـە گـوڵ
شــاری دڵ فــەرق و هــەوای لــەنــدەن و تــارانی نییــە
داوەڵ و پـەیکـەری سـەر کۆشـک و شـەقامـە بـە خـودا
ئــەو کــەســەی خــاتیرەیێ خۆشــی لــە یــارانی نییــە
بـە هـەوای سـروەیـی کوێسـتانە کـە «ئاسـۆ» نـەشـەیـە
بۆیــە گــوێی بیســتنی خــێڵ خــواری هــەوارانی نییــە

بۆکان- ٧٦/٦/٨

## بێوەفایی

دیــارە دونیــا ڕەوشــی وایــە «وەفــا» دەمــدەمییــە
لوتفی جوانان وەک شێخ تاوێ هەیـە و تـاوێ نییـە
خۆم فیدای ناز و کریشمەی نەفەسی ساقی کـە ئـەو
لوتفـەکـەی بـۆ گـەلی مـەیخـۆرەوە هـەر دایمییـە
گەر نەبێ هاوەڵێ چاک و چەمـەنێـک و چۆمێـک
تـۆ کـە شـا بی بـە تـەنـێ ژیـنی وەهـا تـامی چییـە؟
ئەو گوڵئـەسـتێرە چـەلان باسـی وەفـاداری دەکـرد
هەر درەوشانەوەیەک بوو ئـەدی هـیچ نـووری نییـە
من کە پەروانەی ئەو نوورە کەمـەش بـووم سـووتام
ئـەو ئـەگـەر تـینی نـەمـا دیـارە کـە تـاوانی وییـە
داخەکـەم ئێستەکـە نامـەحـرەمـە سیمی تـەلـەفون
تیشکی گوفتاری ئەوین وەک سەمـەری داری بییـە
تاقە یەک سێبەرە بـۆ مانـدوو لـەبـەر تـاوی زەمـان
هەر کە ئێـوارە گـەیـی مانـەوەکـەی شـوورەیـی‌یـە
ئەی گوڵی باخی خەزانـیم! چییـە ناپرسـی لـە مـن؟
یان لەبەر چاوی ئەتۆش عیشق و ئەوین هی زەوییە؟
مـن لـە ئاسمانـەوە «ئاسـۆ» دڵـەکـەم کـردەوە بـۆت
کەچی تۆ غەیبەتەکەت شەمسە دەگەڵ مـەولـەوییـە

ساروقامیش ـ ۸۵/۸/۱٤

خۆزگە دەتزانی کە چەن شێواوە حاڵم بەو نیگات
چۆن دڵت بەن کردووم بەو زولفی کاڵی تابەتات
تۆترووسکەی تاوی ڕوونی بۆ بە ناز سەر دێنیە دەر؟
دەرخە ڕووت با تیشکی کوڵمت ڕوون بکا ئاسۆی وڵات
وێڵی کێیە ئەو تەماشایەت کە ئاوا بێوچان
چاوەکانت هەڵدەسووڕێن هەروەکوو سانیەی سەعات؟
پەنجەرەی جوانیت بەرەو کێ ئاوەڵا کردۆتەوە؟
وا کە دەڕوانیتە هەر کوێ شەوقی جوانی تۆ ئەدات
شاییە، بەزمە، زەماوەندە؛ کەچی کۆتری نیگام
بۆ تەماشاییکی تۆ، بێدەستەڵاتە و گێژ و مات
دەی وەرە ئەی هێزی باڵی هەڵفڕینی ئارەزوو
تینی شیعرێکم دەرێ با دڵ بە ئاواتی بگات
خەم خەیاڵی وەی هەیە خۆی کاتە نێچیری خەیاڵ
چاو کە تاکوو خەم بە دووخەم زەربە کا چاوی سیات
بێتوو «ئاسۆ» پڕ بە دڵ وەسفی جەماڵی تۆ بکا
شەق دەبێ نووکی قەڵەم یان هەڵدەچۆڕێنی دەوات

بۆکان- ١٣٧٥/٦/١٠

## گوڵدانی غەزەل

که دێته گیانی هەڵبەستم تەوژمی یادی جێژوانت
ختیلکەی دێ دڵی وێڵم لە سەیری باغی سێوانت
شەقەی باڵی پەری لە گوێی خەیاڵا قوتبی نامێنێ
که دەمدوێنێ بە ئیما چاوە شینی بەحری عەممانت
ئەتۆ ڕۆحی ئەوینی، دەی وەرە نێو قاڵبی شیعرم
لە گوڵدانی غەزەلدا هەر دەمێنێ بۆنی ڕێحانت
هەزار فەرزانە بێ شاعیر لە دەریای چاوتا گێژە
که ئاڵای هەستەکەی ڕاژێ بە بای بسکی پەرێشانت
وەکوو پووش و پەڵاشم بای شەماڵی هەستی تۆ دەمبا
هەزار خۆزگەم بە ئاڵۆزی خەیاتەی خاوی سەر شانت
وەرە و مەشکێنە شاباڵی مەلی ئاواتی بێنازم
لە نێو هێلانی ئامێزت پەنای دە خێری ئیمانت
بەڵێنم داوە باسی دەردی کورد و کۆیلەتی ناکەم
نەکا بڕژێ لە تاوان گەوهەری فرمێسکی چاوانت
ئەمن هاواری بێدەنگی حەز و ئاواتی خنکاوم
بە بێقەدری تەماشای من مەکە ئەی ڕۆح بە قوربانت!
لە حەوزی گەردنت جارێ کە دەسنوێژی غەزەل بگرم
دەڵێی «ئاسۆ» تەبەڕکە ناو و بەیت و شیعر و دیوانت

بۆکان_ ٧٥/٨/١٠

## محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)

**لە ڕێکەوتی ١٠ی جۆزەردانی ساڵی ١٣٨٦ هەتاوی لەگەڵ یارانی هاوڕێم مامۆستا مەلا عوسمان خانیەغما، مامۆستا مەلا محەممەد ئەحمەدیان، کاک سەید ڕەحیمی ئارام، وەستا کەریم ڕەحیمی، وەستا کەریم چاچانی، کاک حوسەین ئەمینی و کاک حوسەین حەبیبی چووینە کوێستانی ماینبلاغ. کاتێ لەو سەر چیایە ڕوانیمە ئەو بەهەشتەی خاکی کوردان چوومە سەر لووتکەی بڵیندترین کێوی و مامۆستای سورووشت ئەم هۆنراوانەی پێ هۆنیمەوە.**

ئاسۆ

لە نێو خاڵخاڵی بەفری بەر نساران سەیری دونیام کرد
هەتا چاوم هەتەر کا و گوڵ ببینێ تێر تەماشام کرد
هەتا دڵ باوەشی بگرێ گوڵی جوان هەن لە دونیادا
منیش وەک بولبولی شەیدا ئەوی گوڵ جوانە سەودام کرد
وەنەوشە مل کەچ و ئاشق سەری بۆ لۆ و کەما دانا
کوڕادەی نێو گوڵی گوێنی قەدی ئەلفی وەکوو لام کرد
سلاوێکم بە دڵ کرد لەو وڵاتەی خاکی کوردانە
هەزار قومری وەلامیان دامەوە ئەمنیش هەر تەمەنام کرد:
خودایا ئاوەدان بێ خاکی ئاوا پڕ گوڵ و کانی
لە چاوەی مەی لەگەڵ یاران کە چۆڕێکم لە نێو جام کرد

**<u>دەسنوێژی شیعر</u>**

هەوای شیعرێ لە کەللەم دای و مەستی شیعری کوردی بووم
لە سەر لووتکەی کەژێ خۆم دیتەوە، کاتێ کە ئاگام کرد
قەڵەم وەک چاوی چاوجوانان لە ڕاوی گوڵوشەی کوردی
خەریک بوو واژەی ئەڕفاند و منیش سەد بارەقەڵلام کرد
لە سەیری سوور گوڵ و بەفری سپی و سەوزی و هەتاوی زەرد
بە دڵ یادی خەیاتەی پەرچەمی یار کەوتم و ئینشام کرد
لە نێو ماینبڵاغا گەورەیی کورد دێتە بەر چاوم
کە دیتم کەو دەخوێنێ یادی قاقای لێوی سارام کرد
هەوا ڕووناکە، تاو گەرمە، شنەی با فێنکی نێو جەرگە
لە سۆزەی بای شەماڵ هێواشێ ماڵاوایی سەرمام کرد
گەدای بەر دەرکی یار بووم ئەو وڵاتەم هێندە ئاوا دی
هەتا مردن ئەدی تەرکی قەڵا و بەردەرکی پاشام کرد
مەڵێن «ئاسۆ» شیعارە شیعرەکانی خۆی لە سەردا دێ
دڵم ماڵێکی چۆڵ بوو عەشقی هاتێ و ئەمنیش ئاوام کرد

هەواری کانی ترشۆکەـ کوێستانی ماینبڵاغ
٨٦/٣/١١

## تاسەبار (٢)

دەچمە هەر شوێنێ بە یادی خاکی خۆمم تاسەبار
هیچ لە بۆم فەرقی نییە پارک و زرێ و کۆشک و تەلار
چاو لە هەر چاوێ دەکەم دڵ بۆی دەکورکێنێ کەمێ
ڕۆشنی ناکا دڵم وەک بەرقی شەوقی چاوی یار
تینی تاوی خۆشەویستی شک نەبەم سەرمام دەبێ
بێئەوین بێ فەرقە لای من بەهمەن و ئاب و ئەیار
شاری بۆکانم لە باکۆ خۆشترە زاڵم نەبێ
چۆم لە دەریا جوانترە گەر لێمگەڕێ ئەفکاری لار
لێمگەڕێن با پڕ بە دڵ بمژم هەناسەی سوورە گوڵ
تیشکی ئازادی بدا لەو شیعرەم و بێتە شیعار
هێندە تیری شەو دڵی داگرتووم ڕەشبین بووم
دێمە پاتەختی وڵاتی سۆڤیەتیش ناگرم قەرار
ئەی کچە تورکی دڵئەڕفێن خۆت لە بۆ من با مەدە
پیری کردووم چەوتە یاسا و ترس و لەرزی عەیب و عار
خۆ دەنا من وەک پەپوولە هەر گوڵم بوو بۆ تەواف
جێی شەوم خۆش بایە قەتقەت نەمدەکوت خوزگەم بە پار
داخەکەم ئەو هەستە «ئاسۆ»ی فێری ئاشقێنی دەکرد
کەس نەبوو تیماری کا غەیرەز چەقۆی دەستی نەیار

باکۆ ـ ٨٦/٣/٢٧

## دەسنوێژی شیعر

تاو لە بن هەورا ئەگەر جارجار سەری دێنێتە دەر
تیشکی زێڕینی دەڵێی تاجێکە کێو ئەینێتە سەر
ئەو خەمەی لە دڵم گرانە هەر دەڵێن زێڕ جوانترە
کوانێ تابلۆ جوانترە تا سەوزەڵانی دەشت و دەر؟
وێنەگر کوا ڕەنگی زەردی نەرگسی بۆ ساز دەبێ؟
چاوی مەستی یارەکەی بێت و بە فریای بێ مەگەر
ڕەنگی ئەسڵی هی نیگایە، زەرد و سوور و شین چییە؟
ڕەنگ هەموویان هەر ڕەشن تا نووریان نەڕژێتە سەر
ئەی بە ڕوو باغی بەهارم! تۆم نەبی مانام نییە
چاوی تۆ دیکتەی دەکا پێم شیعر و پەخشان و هونەر
تاو و ئەستێرە و شەو و باران و بادە و مانگەشەو
بێبزەی لێوی ئەوین گشت دەبنە خەرمانەی کەسەر
دێیتە یادم، سەر لە بادەی تاڵی خەم سەرمەست ئەبێ
لێم دەتۆرێی، پێکەنین قاچاخە نابێت کاریگەر
بۆیە خۆم پێ پیر نییە ئێستەش نیگا لاوم دەکا
ئەو دەمەی پیرم ئەگەر چاوم نەبینێ چاو سەقەر
هەور ئەگەر بگرێ بەری «ئاسۆ» مەترسێن وادەیە
دایبکاتە ڕێژنە بارانەی شیعر بۆ ژانە سەر

بۆکان_ ٨/١٠/٨٠

## کەو دەبینم

کــەو دەبیــنم ڕەوتی کیــژی تیلــەکــۆم دێنێتــە بــیر
شــەو دەبیــنم زولفــی قــەتــرانی ئــەتــۆم دێنێتــە بــیر
دەچمە سەر باڵی خەیاڵی ڕۆحی عەشقی تـۆ لـەوێـش
یـادی چـاوت زەیـنی تیـژی وەک هـەڵـۆم دێنێتە بـیر
باسـی دڵـداریم بـەبێ دڵ گـەر دەکـەن لێـرە و لـەوێ
پاکی عـەشـقی چـاکی تـۆ و ناکـامی خـۆم دێنێتە بـیر
هەر دەبینم کیژی سادەی کـورد سـەرئێشـەی شـیعرمە
چونکە یادی شـەنگـەبێـری و شـیر و چـۆم دێنێتە بـیر
قەت نەبوو جارێ خەیاڵی لێوەکـەت شـەکـرین نـەبێ
چونکە لێوت عومری شیرین وەک گـەزۆم دێنێتە بـیر
هـەڵـفڕینی مـن بـە یـادی چـاوی تـۆ سـەیـری نییـە
گرشـەگرشـی چـاوەکـەت میـزان و کـۆم دێنێتـە بـیر
گەر بەهار دێ من بەجێـی شـادی دڵـم نـوقمی غـەمـە
چونکە فەسڵی کۆچی سوور و شین و ڕۆم دێنێتـە بـیر
باسی شیعری دەرد و ڕەنج و عەشق و شەیدایی مەکەن
چون مەبەستی شیعری «ئاسۆ»ی شـێتی تـۆم دێنێتـە بـیر

ساحێبـ سەقزـ بەهاری ٧٤

## هەویری وەفاداری[1]

چییە دیسان دڵە؟ بۆچ ناسرەوی ئەوشۆکە؟ زەویر!
بە کەمەندی دڵی کام ڕاوچییە کەوتوویەوە گیر؟
نەمکوت ئەم ڕێگە بەرەو جەبهەیێ دەڕوا کە لەوێ
زولفە زنجیر و برۆ شیر و نیگای پڕ قسە تیر؟!
من بە منداڵی، خەدەنگی موژەیەک جەرگی گەزیم
ئێستە سی[2] وەرزە کەچی یەک نەفەسم ناچێ لە بیر
نانی تێدا نییە، لێی لادە؛ مەگەر بەو شەرتەی
(کە لە تەندووری وەفاداریێ بۆی ببیە هەویر)
کۆترێ تەقڵە لە هەوران کە بدا بێخەبەرە
لە یەکەم چەرخی هەڵۆی چاوە کە دەیکاتە نەچیر
ڕەنگە ئاواتی فڕینت هەبێ تاوێ لە چیا
هەر کە دیت باوەشی گوڵزارێ لەبۆی دەبیە ئەسیر
بەسیەتی باڵی فڕینت هەیە بۆ تەشقی حەوا
بهورووژێنە بە شاباڵی شیعر کۆشکی ئەمیر
قەد نەترسێی لە هەژاری دەبێ شا بێتە گەدات[3]
بەخودا «ئاسۆ» قەڵا هەر دەبێ بشکێ بە فەقیر

پارکی شاری سەقز_ ٧٤/٤/٥

---

١ – ئەم شیعرە لە شوێنێکی تردا ناوی «گۆڕان» بوو.

٢ – لە «گۆڕان»دا چل وەرز بوو.

٣ – لە «گۆڕان»دا ئەم باڵە ئاوەها بوو: هێندە عاشق بە هەتا «ڕۆژ» دەبێ کڕنۆش بەرێ بۆت.

کێیــە ناترســێ لــە شمشــێری بــرۆی دوو چــاوی کــاڵ؟
کــێ دڵــی دی چــاوی میــوانی ئــەویــن دەرکــا لــە مــاڵ؟
مــەیکــە دەر ســۆزی ئــەوینــداری لــە ترســی ناکــەســان
ڕۆحی ئەم ئاهەنگی عەشقەت بێتە گوێ، نەک زیڕی قاڵ
هــەر بــەهــارێ ترســی پــاییز وادەکــا چــوار وەرزەکــەم
شەو لە خزمەت گوڵ بناڵێم تــاکوو ڕۆژ بــە زمــانی حــاڵ
تــا خشــەی پێــی خۆشــەویســتی دێ بــە چۆمــاوی غــەمــا
تووڕەکەی مــەینــەت ئــەدی پڕپــڕ دەبــێ لــە شتی بــەتــاڵ
ســۆفی و پــەروانــە، حــاڵ و باڵــە هێــزی ڕێگــەیــان
ئــەو کــە حاڵــی خــۆی بــەســە و پــەروانــە بێــزارن لــە بــاڵ
شــاپەڕی بــڕوا لــە ئاسمــانی نیگــا تــا هــەڵــوەرێ
جا ئەدی چۆن هــەڵفڕێ تــەیــری کــزی بــیر و خــەیــاڵ؟
هێــزی هــەڵــبەســتی نییــە وەســتای ئــەویــن و ئــاوەزم
چت دەوێ تۆ ئێستە لــە مــنی لاوی زەوق و پــیری ســاڵ
هــەڵــفڕینی باڵــی بولبــول چــەپڵــەیــە بــۆ وەزنــەکــەی
شیعری «ئاسۆ» تاوەکوو دەشنێ بــە ســروەی بــای شــەمــاڵ

ساروقامیش ـ ٧٧/٧/٥

دەرکــەوێ گوشــەیــی چــاوت بــە جیهــانی نــادەم
غـەمـی تـۆ هـاودەمـی مـن بـێ بـە کـەسانی نـادەم
قـەدی تـۆ گـەر لـە قـەدەم هالّـێ چـەلێکـی چ دەبـێ؟
ئــەو دەلّــێ دووخــە قــەدی مــن بــە کــەوانی نــادەم
چاوی تۆ چەشنی هەلّۆی چێن و لە دووی دڵ دەگەڕێن
دلّــی مــن پارچــەیــێ گۆشــتە و بــە ئــەوانی نــادەم
پــێم دەلّــێ شــاعیری تــۆ لووســە زمانــت لــە قســە!
تیغــی خــۆم تیــژە ئــەدی مــن لــە هــەسانی نــادەم
من دەڵێم زۆر کەوی وەک تۆم بە قەڵەم خستووەتە داو
ئــەو دەلّــێ بــەســتەیــە پــێم بۆیــە تــەکــانی نــادەم
شیعری «ئاسۆ»ت کـە هـەبێ بێ‌خـەمی بێ‌تاقـەتی بـە
بـــایی ماچێکـــە مـــەترســـێ بـــە گـــرانی نـــادەم

بۆکان/ سەقز- هاوینی ٨٦

(...)

ئـەم هـەوا هێنـد ئاشـنایە بـۆنی شـیعر و هـەسـت ئـەکـەم
چونکە «جەو» سارد و سڕە پەنجەی دەبەسـرێ دەسـتەکـەم
سەوزەیەک دێم گەر بە یـادی سـەوزەیێکـی چـاو کـەژاڵ
پـڕ غـەمـی یـادی منـاڵـی و کـاتی لاویـن بـەسـتەکـەم
شۆڕە پـەلکـەی وەک خـەیاتـەی یـارەکـەم یـادی بـە خێـر
ئێسـتە بـۆ یـادی مـەگـەر زولفـی خـەیاڵـم دەسـتە کـەم
مـەسـتی و بـادەش ئـەوەنـد قاچاخـە خـۆ ناوێرمـە مـەی
بۆیـە پێنووسـی خـەیاڵـی شـاعیرانەم مـەسـت ئـەکـەم
گـەر چپـەی دڵـدارییانەی تـۆ نـەبـێ تـەنگـە دڵـم
دەی وەرە ئەی غەمڕەوێن ئاگر دە جـەستەی هـەستەکـەم
کۆشکی سەد «سوارەی» لەبن هێناوە ئەم چەرخەی چەپـەڵ
سەیری چاوی تـۆ نـەبێ مـن دڵ بـە چـی وابـەستە کـەم؟
ڕەخنـەگـر موختـارە هـەر پێـی وابـێ ڕێگـەم هـەتڵـەیـە
گەر بە گۆچانیش بـڕۆم یـادی بـرۆی پـەیـوەست ئـەکـەم
تـاکوو «ئاسـۆ»! چـاوی تـۆ ڕوونی دەکـا تـاری دڵـم
فەلسەفەی چی؟ ئیدی کەی من باسی «قبض و بسط» ئەکەم

قەرەگوێز ـ هاوینی٧٧

## هاوارانە

**بۆ کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو «شپرزەی سەقزی»**

وا هــەمیســان شــیوەنی کۆچبــاری نــازداران ئــەکــەم
دڵ بــە تاســەی خاکــەلێــوەم ئــارەزووی بــاران ئــەکــەم
کاتێ جــێ‌پێــی هــاوەڵان دیــارن لــە بــەرزایــی و نــەوی
یادی شادی و شیعر و شین و مەجلیســی یــاران ئــەکــەم
من کە جــاران لاوکــی گوفتــاری تــەڕ بــوو زەمــزەمــەم
ئێستە شین بۆ گەرد و تۆزی کــۆچی دڵــداران ئــەکــەم
هاوەڵان! مــەنعــم مــەکــەن بــۆ شــیوەنی ئــەهلــی قــەڵــەم
پێش ئەوەی گەر ڕەخنە بگری، گوێ گرە هاوارانەکەم
کەس نەما، باخ چۆڵ و، قومری ناڵەناڵــی دێ لــە دوور
شوان کــونی شمشماڵــی گــیراو، وشــکەڵــە ئارانــەکــەم
ئێســتە چــۆپی‌گــر غــەمــە و شــین‌گێــڕە گــۆرانی دەڵــێ
هەر هەنیسکە بۆتە جێگــر قــەهقــەهــەی جــاران ئــەکــەم
من کە جاران شایەری «شایی» پــەپوولــەی دێ دەبــووم
ئێســتە ماتــەم‌گێــڕی «شــینی» بولبــولی شــاران ئــەکــەم
کوا هــەژار و هــێمن و ئــاوات و حــافز؟ وا لــە کــوێن؟
بێنــە پێشــوازی شــپرزە و گــوێ بــدەنــە گریانــەکــەم؟
کوا حەقیقی و مارف و ژیلا "بە خێــر بێــی" پــێ بڵــێن؟
«باغی داغاتیش» ئــەوا چــۆڵ بــوو لــە کوردوســتانەکــەم

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

وا لـە بـەر یـەک تێکچـووە ڕیـزی قـەتـارەی قافییـەم
ڕۆحی «شێخ نـافیع» مـەگـەر فریـام کـەوێ باوانـەکـەم
مـن دەنـا «ئاسـۆ»ی هومێـدم هێنـدە لـێڵ و پـڕ تـەمـە
حـەسـتەمـە شـیعرێ بڵـێم و دیـار نـەبـێ گریانـەکـەم

بۆکان- ٧٧/١٠/١٠

## دەسنویژی شیعر

چەندە حەسرەتکێشی ساتێ سەیری نێو باغانەکەم!
چۆن بە وێنەی تەیری شاری شەڕ نەما هێلانەکەم!
تاوەکوو تۆم بووی لە زستانا بەهارم هەست ئەکرد
دیوتە ئێستا چەندە سارد و چۆڵ بووە جێژوانەکەم!
مەی ڕژا، ساغەر شکا، ساقی نەما، مەیخانە چۆڵ
باسی دڵتەنگی گەلی بادەپەرەست هەر با نەکەم
بای شەماڵی خاکەلێوە بوو بە زریانێکی دڕ
دای بە سەر یەکدا هەموو بادە و نەشە و پەیمانەکەم
غەیری ئاواتی دەمێ سەیرانی نێو باغت نەبێ
دەنکی تۆ دەرمان نەما ئاواتە ڕەنگی و جوانەکەم
دەی وەرە با سووکی تانەی خۆشەویستیت بم، دەنا
دەمکوژێ لەم حاڵەدا قورسیی خەمی سەرشانەکەم
چۆم و دار و سەوزەلانی و بانەمەڕ بانگم دەکەن
من خەیاڵی پەرچەمی تۆیە شنەی کوێستانەکەم
با وڵاتیشم لە ناو خێڵی قەل و داڵا بژی
من هەڵۆم هەر یادی بەرزی و شیری کاکێشان ئەکەم
چونکە «ئاسۆ»م چاو لە ئاسۆی ڕوونی دوارۆژ چۆن نەکەم؟
چاوەڕێم ڕۆژێ دەبێ ڕوون بێ منیش چاوانەکەم

بۆکان- ٧٥/٢/٢٧

## محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)

جێژنی نەورۆزە و ئەمن هەر یادی ڕۆژی کۆن ئەکەم
تا خەفەت بگرێ بەری دڵ، هەست بە شادی چۆن ئەکەم؟
ئەرخەوان سووری هومێدم لێڵە کانیاویش وشک
لوورەلووری دێ لە گوێی چۆم و دەراوە کۆنەکەم
ڕاستە وا وەرزی بەهارە و شینکە سەریان هاتە دەر
پڕ بە دڵ لۆمەی ژیانی ئەم هەوایەی بۆ نەکەم؟
کەس بەهاران گوێ لە تەققەی نووکی لەکلەک ناگرێ
بۆ منیش سفرەی خەیاڵی شیعر و هەستم کۆ نەکەم؟
کەس لە بۆ چۆم و شەتاوی بەربەیان ڕاناپەڕێ
چۆن لە بۆ مەرگی بزەی ئەم خاکە من ڕۆڕۆ نەکەم؟
نان و دۆ وابوونە پەردەی چاوی جوانبینی خەڵک
شەرتە بشزانم کە دەمرم یادی نان و دۆ نەکەم!
وا بە کۆڕیارانی «تەنیا» جێ دەهێڵن یەکتری
بۆ منیش ئێستا بە تەنها شیوەنێ بۆ خۆ نەکەم؟
ڕاستە ژین مەرگی لە شوێنە و داری ژین میوەی ئەجەل
بۆ بزەی لێوی گولالان حەیفە وەک «ئاسۆ» نەکەم

بۆکان- ٧٧/١/٥

کاتێ سەیری دەشت و کێو و قەڵبەزەی بەفراو ئەکەم
جوان سەمای پەریان ئەبینم، هەستی ماچی تاو ئەکەم
تیشکی تاوی نەوبەهاری کاتێ دەنگێوێتە کێو
هەستی زیندووبوونەوەی بنجی گوڵی فەوتاو ئەکەم
من لە شاگردانی مامۆستای سوروشتم داخەکەم
ئێستە بێمافم لەوێ، هەر تیشکی یادی ڕاو ئەکەم
سەردەمێ لانەی دڵم نێو بسکی خاوی سەوزە بوو
دەرکراوە دڵ لەوێ، بۆیە خەیاڵی خاو ئەکەم
دوورەبیری و ناتەبایی بۆتە خۆرەی تێگەیین
بۆیە پەنجەم سڕ بووە و هەر ئارەزووی بەر تاو ئەکەم
بێ کەسی و بێدەستەڵاتی و عاشقی دۆستی یەکن
بۆیە تا هەم چاو لە چۆن ژینی گوڵی لاولاو ئەکەم
چشم بر راهی و فقر و تنگدستی بس نبود؟
ای حسود سنگدل! کم زن به زخم ناوکم
تاوەکوو وا پێم ڕەوا بێ شەربەتی تاڵی ژیان
کەی لە «ئاسۆ»ی بیری خۆمدا ئارەزووی شەکراو ئەکەم؟

بۆکان- ٧٦/١١/٢٢

## ویسالی نوور[1]

سەردەمێکە ئارەزووی چاوێکی وەک دەریا دەکەم
ئارەزووی بەرتینی تاوی بەندی دەست سەرما دەکەم
لێی گەڕێ با هەر لە فێڵی بن گەلی خۆخۆرەکان
من بە یادی چاوی تۆم، تۆ چی بڵێی هەر وا دەکەم
سێبەری عیشقم لە سەر بێ تاجی شاهیم بۆ چییە؟
تیشکی چاوێکم هەبێ گاڵتە بە شێخ و شا دەکەم!
تاترووسکەی بەرقی جوانی دەرکەوێ پەروانەییم
بۆ ویسالی نوور هەمیشە کاری بێپەروا دەکەم
گەر هەواڵی تۆ بە شەودا بای شەماڵ بێنێ لە بۆم
ڕێزە ملوێنکێ وشەی جوان پێشکەشی شەوبا دەکەم
من دڵم کانگەی ئەوین و دار و بێری و کانییە
نا، پەشیمان نیم لە ڕێگەم، دڵنیا بە، چا دەکەم
نایەڵێ تاوێ لە ئاوێنەی خەیاڵا دەرکەوی
بۆیە وەک مەجنوونی بێکەس دایمە یا لەیلا دەکەم
تۆ هیلالی دوو برۆت دەرخە لە «ئاسۆ»ی جەژنەوە
تا بزانی چۆن بە یادت مەحشەرێ بەرپا دەکەم

بۆکان- ٧٥/١١/٢٥

---

١ – ئەم شیعرە لە شوێنێکی تردا ناوی « ئارەزووی جەژن» بوو.

## بیر

تـا خـودا حـەز کـا پـەریلـەم! بـیری دیـدارت دەکـەم
بیری چاو و زولف و کولّم و بەختی نابـارت دەکـەم
هێند دڵم بۆت تەنگە پێم وا شارەکەم چۆڵچۆڵ بـووە
بیری هاتوچۆی دەماودەم عـەسر و ئێـوارت دەکـەم
سـەردەمـێ وەک بولبـولی شـەو بـۆ دڵـم پاڕایـەوە
هەڵفڕی و ڕۆییت؛ کەچی هەر بیری گوفتارت دەکەم
شـیوەن و فرمێسـکی تـۆ بـارانی وەرزی سـەوزمـە
یـادی بارانـت ئـەکـەم، بـیری وتـەی زارت دەکـەم
چاوەکەم! تۆ هەر مەزانـە چـی لـە دڵـما دێ و دەچـێ
مـن هـەمیشـە ئـارەزووی ئـەخـلاق و ئاکـارت دەکـەم
بـیری بـۆنی بسـکی ئاڵـۆز و خـەیـاڵاتی تـەڕت
هەستی ئەو هەست و نیـازەی بـێپـەرەستارت دەکـەم
خۆت لە نێو هەڵبەستی مندا کردە ئوستوورەی ئـەویـن
بۆیە تا هەم مەدحی ئەبرۆی تیغی خوێنخوارت دەکەم
باسـی عیشـقی کـۆنی تـۆ بـۆم نایـە بـە قسـەی تـازەوە
بۆیـە دایم ئـارەزووی مـەیـل و قسـەی پـارت دەکـەم
هـەر غـولامی تۆیـە «ئاسـۆ» بۆیـە تـا مـردن دەڵـێ!
«تا خـودا حـەز کـا پـەریلـەم! بـیری دیـدارت دەکـەم»

بۆکان- ٧٨/١/٢١

## بێقەرار

دەچمە هەر کوێ تۆم لە یادی، ئەی وڵاتە جوانەکەم!
شەرتە پیریشم لە لای تۆ ڕابرێ باوانەکەم
هەرچی جوانی هەندەران و دیتران زۆر ناس دەکەم
زۆرترم تۆ خوش دەوێ، ئەی خاکی کوردوستانەکەم!
ئاوەکەت بۆنخوشە، خاکت پڕ لە پیت و شەوکەتە
بای شەماڵت دڵڕفێنە وەک نیگای چاوجوانەکەم
کەزیەکاڵی هەندەرانی نایبزێون هەستی من
شەرتە بەو پەنجەم فەقەت بسکی ڕەشی تۆ شانە کەم
تا شەتاوی پڕخرۆشت شک بەرم بەحرم نەوێ
چاوی شینێ شک بەرم قەت ئارەزووی دەریا نەکەم
دوورخراوی و بێکەسی و مەجبوورە کۆچ، فەرقی هەیە
من کە مەجبوور نیم بەجێت بێڵم، قەرار بێ وا نەکەم
خاکی بێگانان بە مەوتەن ناکرێ مەجبوور نەبی
غوربەتی عەهدە هەتا زیندووم لەگەڵتا تا نەکەم
ڕاستە یاری هاودڵت بێ خۆشە، ئەمما گوێگران!
هاوزمان بێ خۆشترە قژکاڵە دەسگیرانەکەم
بۆیە «ئاسۆ» قەت خەیاڵی هیجرەتی پێ خۆش نەبوو
دەچمە هەر شارێکی بیری شارەکەی بۆکان ئەکەم!

باکۆ/ سێشەنبە ـ ٨٦/٣/٢٩

تۆبە چۆن دەکرێ لە عیشق و خۆشەویستی گیانەکەم؟
شەرتە تا ماوم لە ژیندا قەت خەیاڵی وا نەکەم
لێم گەڕێن تەڕ بێ قولاپەم تا بە شەونم، با ئەدی...
ئارەزووی سۆنەگەریی نێو گێژەنی دەریا نەکەم
لەو هەموو ڕەنگانەوە و دەنگدانەوە گوێم پڕ بووە
دەنگ و ڕەنگ ئێستا درۆن، با کاری وا بێجا نەکەم
ڕەنج و دەرد، مافی هەوڵ و دەستبەتاڵی ئێستە باو
خۆ دەزانن گەل هەموو، کای کۆن ئەدی با بــا نەکەم
لێرەکانە کێشەیە بۆ تۆزێ وەک ئینسان ژیان
هاوەڵان! مەنعم مەکەن، چۆن ئارەزووی ئەولا نەکەم؟
خۆ لەوێ هەر هیچ نەبێ هیچکەس لە برسا نامرێ
جا چلۆن من خۆم غەریبی سەرزەوی وا چا نەکەم؟
دڵپڕم، هەر کەس دەبینم خوێن لە دڵیایە و کپە
شەوگەلی تاریک و لێڵ، بێسوودە ئیدی مانەکەم
کێ وەکوو «ئاسۆ» غەریبی نیشتمانی خۆیەتی؟
ڕوولە هەر لا کەم فیداتم ئەی وڵاتە جوانەکەم!

بۆکان_ ٧٧/٥/٨

قەت مەپرسە و پێم مەڵێ تۆ بۆچی نابەی ناوەکەم!
نێوی تۆ کوانێ لە نێو کاغەز دەگونجێ چاوەکەم؟
لاپەڕەی مێژوو ئەوەند بەرتەنگە جێت نابێتەوە
ئەی لە مێژوو گەورەتر! بارانی بەیت و باوەکەم!
تۆ وەرە نێو قاڵبی شیعرم لە مێژوونووس گەڕێ
هەستی من مەزرای ئەوینە و عەشقە جۆگەی ئاوەکەم
ئەم چنارستانە وا ڕاست هەر بەرەو بەرزی دەچن
لێرەواری عەشقە من قومری ئەوینم ڕاو ئەکەم
وا چرۆی ئاواتی یەک یەک لێ دەپشکوون بێوچان
خوا شوکور گوڵزارە ئێستا جێی گوڵە فەوتاوەکەم
سەر لە سەر تاجی هەور بێ و چاو لە زوهرە و موشتەری
ڕووت و هەر پێخاوسم لە شوێن گوڵە دۆڕاوەکەم
ئاسۆ گەر سووری گوڵالانت لە بەر چاو ون دەکەن
چاو لە ڕووسووریی ئەوین کە، ئەو گوڵە هەرماوەکەم

سقز ـ ٧٧/٣/٣٠

## باغی بێگوڵ

بـە دڵ دڵـداریٚ نـابینی، لـە شـاری بـێدڵان چ بکـەم؟
گوڵت تێدا نییە ئەی باخ! لـە بـاخی بـێ گـوڵان چ بکـەم؟
چـەمـەن پـاراوی خوێنـاوە و چنـاریش بـەژنی چـەمیـاوە
نـەڕۆم لـەم شـارە ویرانـە ئـەدی ئـەهلـی دڵان چ بکـەم؟
غەریبم، دەچمە هەر شـوێنیٚ دەڵـێی خـەڵـکی وڵاتی دیم
کەسم لـێ بوونـە بێگانـە، لـە هـاوڕیٚیـی فـلان چ بکـەم؟
لە هەر کووچەی ڕەگی شارا دەچۆڕیٚ خـوێنی خۆماڵـی
دڵی شاریش بە دەس خەڵکە، لە شاری غافڵان چ بکـەم؟
ئەمن هەر بیسـتبووم جـاران کـە ئاسـک وا سـڵ و سـرکە
لە سێبەر ڕەو دەکەن یاران، لە نێو کۆڕی سڵان چ بکـەم؟
دەڕۆم ئـەم خاکـە پـیرۆزە هـەزاران هێنـدە شـیرین بـێ
ملـەی تێدایـە، ئـاخر مـن لـە نێـو خـاکی مـلان چ بکـەم؟
منـــیٚ گـــۆزەی دڵـــم دایم لـــە بۆتـــەی عیشـــقدا قاڵـــە
لە نێو خـاوانی دڵ کاڵـی، نـەدیـوی نێـو کـلان چ بکـەم؟
بڕۆ سوارە عەمەدرێژ بی ـکە نەشبووی ـ ئێرە کـەی باخـە؟
کە شەوبۆ بۆنی خۆی نـادا، لـە بـۆنی کـاگڵان چ بکـەم؟
وەڕەز بوو ڕۆحـی «ئاسـۆ» کـەت ئـەوەنـدە قـومریئاسـایی
لە سەر پەڵکی گوڵان ناڵی، لە ناڵەی سەر چڵان چ بکەم؟

بۆکان ـ ٧٧/١٢/٢٠

شەرتە تا مابم لە ژین سەرمەستی دوێ ئێوارە بم
با لەوەش زیاتر زویر و بێکەس و بێچارە بم
ئەی پەریزادی خەیاڵی عاشقانی دڵبەسۆ!
کەم بە ناز و عیشوە بە، با کەم منیش ئاوارە بم
گوارە جێگەی گوێچکەیە، بۆ هاتووەتە سەر ڕوومەتت؟
دەک فیدای ئەو لارەلارەی پڕپڕەی ئەو گوارە بم
تۆ تریفەی مانگی بەدری و سینەکەت شاری ئەوین
چی دەبێ ئەمنیش هەژار و جڵشڕی ئەو شارە بم؟
گوارەکەت کوردانە هەڵواسیوە ئەمما ڕوومەتت
وەک بەهەشتە، یاڕەبی خنکاوی ئەو سێدارە بم
چوارچرایێکی بەڕێزە چاوەکەم دوو کوڵم و چاو
لێم گەڕێ با من بەتەنیا نۆکەری ئەو چوارە بم
هاوەڵان! مەنعم مەکەن وەک باغە دیداری و منیش
لێم گەڕێن با باغەوانی باغی بەم ئەشعارە بم
هەر بەتەنها عاشقی «ئاسۆ»یە شاری گرتووە
شەرتە تا تینم هەبێ هەر شێتی ئەو دڵدارە بم

٧٧/٥/١٠

## لەرزانە

نایــەڵــن مــەجنــونی وێڵــی ئــەم چیـا بــەرزانــە بم
لـێم‌گـەڕێـن تـۆ بی خـودا بـا هـەروەهـا دێوانـە بم
خۆ بەشی من هەر تەب و لەرزە و تەمە و بەفر و سەهۆڵ
یـان بسـووتێم گـڕ گـرم، یـان لـێم‌گـەڕێـن لـەرزانـە بم
گــەر ئــەوینـداری لــە ئــەم دەورانــەشـا تاوانــە هــەر
ڕێیــەکــی دیم پــێ نیشـان دەن تـۆ خـودا تـا وا نـەبم
مــن کــە نــەمتــوانی موریـدی خانـەقـای خاسـانی بم
لـێم‌گـەڕێـن بـا خڵـتەنۆشـی گۆشـەیـی مـەیخانـە بم
خــۆ دەزانم ســەوزەڵانی گــۆڕی یــاران چــی دەڵــێن
تاکوو سەوزەم شین نەبوون با شـێتی ئـەو سـەوزانـە بم
مـن کـە شـێتی دەسـتی پـەریـانم دەبـێ ترسـم چ بـێ؟
هەر پەریش حەشرم دەکا دەک یاڕەبی هـەر چـا نـەبم!
تۆ «وەجاغی»، «تۆ شەڕابی»، تۆ «شەمی»، تا کەی منیش
دوور لە تـۆ «دێوانـە» بم، «پـەیمانـە» بم، «پـەروانـە» بم؟
کـۆن بـووە چیرۆکـی زیـن و مـەم لـە بۆتـان و جزیـر
هــەلیــە «ئاســۆ» بــا مــەمێکــی تــازەی ئــەم بۆکانــە بم

بۆکان_ ٧٣/١٠/٢٩

## ترپەی پێی خەیاڵت

که ترپەی پێی خـەیاڵـت دێتـە نێـو جێـژوانی هـەڵـبەسـتم
غەزەل ڕادەچڵەکێ وەک شێت، دەتۆقێ کانی هەڵبەستم
که هاتی، مات ئەبێ چرکەی سەعاتەژمێر، زەمان دەنـوێ
زمـان دەگـرێ فریشـتەی لاڵـی بـێتـاوانی هـەڵـبەسـتم
تکەی فرمێسکی شادیم و تکەی ئاوەنگی سەر کوڵـمەت
مەبەستم تەڕ دەکەن جا دێ بـەخـوڕ بـارانی هـەڵـبەسـتم
ترووسکەی چاوەکانت دەبنە تیشکی هەست و هیـوا بـۆم
دەنـا زسـتان دەبـەسـتێ ئـاوی بـەر بـەریـانی هـەڵـبەسـتم
لە خەڵوەت‌دا که سروەی یادی تۆم دەشنێ بە ڕوودا شەو
بە شانەی زولفەکەت دەگرێ شەنی خەرمانی هەڵـبەسـتم
بەڵێ تۆ وەک گەزیزەی ساڵـە جـارێ دێیـە سـەرووەخـتم
سەفای دڵمی و سەفابەخشی کەژ و کوێستانی هەڵبەستم
لە من شەرمێ مەکە، ڕووم تێکە، ڕووت جامی جیهان‌بینە
گوڵێکی تازە پشـکووتووی لـە نێـو بێسـتانی هـەڵـبەسـتم
لە پـەنجێـرەی خـەیاڵـی سـەوزی تـۆوە مـن بـەیـانیم دی
مەترسێ ڕوونە «ئاسـۆ» عـەیـنی نێـو چـاوانی هـەڵـبەسـتم

بۆکان_ ٧٣/١٢/٦

## نمی باران

بـــه ســـــەر گـــۆڕی خـــــەیـــالاتی شـــــەهیدمـــــدا دەڕۆییشـــــتم
لـــه ژێـــر بـــاری خــــەمـــی ئێســـتا بـــه ڕابـــوردوو چـــەمـــی پشـــتم
کـــەژ و کێـــو و چـــەم و ڕۆبـــار و حـــەوشـــە پـــڕ لـــە ئـــاوازن
مـەلان گشـت پـێم دەڵـێن خـاوە خـەیاڵـی بـێ نـەشـە و گشـتم
دەڵـێن: «تـۆ چیـت خـەیاڵـە بـەدبـەخـت؟ بـۆچ نـاچریکێنی؟»
بـەهـار دەیکـوت: «بـە بـاران، چڵـکنی دڵ چـی هـەبـوو شوشـتم»
سوروشت دەیکوت: «وەرە لێم فێر بە سووری و سپیەتی و سەوزی»
هـەتـاویش تیشـکی زێـڕینی خـەمـی بـێ «پـەرچـەمـی» کوشـتم
منیش یـەک «سـەوزە» هـاتم چیمـەن و دار پـاکی گوێیـان گـرت
گـوتم: «تـاکوو نـەبۆتـە چـینی خـانووی ڕۆڵـەکـەم خشـتم»
بـــه ئـــاونگی ئـــەویـــن و تـــۆزی مێـــژوو ســـاز بکـــەم شـــیعرێ
زەمـــان نـــــەیشـــــواتەوە، دێـــــڕی بمێنـــــێ لای بـــــەر و پشـــــتم
زمـانی شـەشـپەڕی شـین بـوو لـە سـەر گڵـکۆی عـەزیـزانم
مـــەگـــەر بـێن و قـــەڵـــەم تێـــر کـــەن لـــە ئیحساســـاتی نازشـــتم
لـە سـەر گڵـکۆی عـەزیـزان پـاڵ وە کێلـی قـەبـرەکـەی دایـە
لـــە «ئاســـۆ»دا نمـــێ بـــارانی شـــیعریم شـــک دەبـــرد ڕشـــتم

ساروقامیش ـ ١٣٨٥/١/١٠

له دەنگی باڵی مەل شێتم، له هارەی سەر شەتاو شادم
هەتاوکوڵم و چەمەن ڕوخسار و گوڵ تۆ دێنێتەوە یادم
دەڵێن خۆشە جریوەی مەل لە کاتی بەربەیانیدا
بەڵام من هەر بە مۆسیقەی ئەوینی تۆیە دڵشادم
ئەوا قوربانە، دەی قوربان! وەرە بۆ گەردنئازایی
ئەسیری تۆم هەتا مەحشەر، نەکەی لەو بەندە ئازادم
له بۆ وەسفی شەپۆلی سینگی تۆ دەنگی غەزەل سووکە
مەگەر قوڵپەی شەتاوی خۆشەویستی بێتە فریادم
ئەمن خنکاو و داماوی تەڵە و داوی درۆی دینم
نەترسای پێت بڵێن کافر کە وا هاتیتە ئیمدادم؟
کەسێ لەم شارەدا بۆ من قسەی شیرین نەبوو وەک تۆ
کەوا نەتهێشت بە بادا چێ گەزیزەی ڕەنجی فەرهادم
کە سرتەی خۆشەویستی تۆ بە گوێی چۆما دەچرپێنم
بریقەی بەرزگی ماسی دەپرسێ شیوەن و دادم
ئەمن «ئاسۆ»ی خەمی کوردم وەکوو ئوستادەکەم هێمن
هەتا مردن ئەویننداری پەریزادی مەهابادم

ساروقامیش ـ ٧٨/١/٩

(...)

عەجایەب حاڵەتێ سەیرە، نە سەرمەستم، نە هوشیارم
لە کن بێگانە سەرخۆشم، لەگەڵ خوێشانم ئەغیارم
دەبا بشکێنن ئێسقانم؛ بەڵام کەس گۆشتەکەم نەخوا
کە من ئێستاکە دڵخوێنم لە دەس خۆیی و کەس‌وکارم
سکووتی پڕ هەرای ڕۆحم دەروونی کردە شیوەنگا
کە نیسێی هەستی شادیشم بووە جارڕز لە ئاکارم
نە بولبول وەک چەلان دەنگی لە گوێمدا خۆش‌نەوا ماوە
نە قاقای پێکەنینی کەو دەبێتە قاسپەکەی یارم
ئەرێ من چیم، شەلم، شێتم وەیا شەوگەردی شارانم؟
بەڵام نا! چی دەڵێن بیڵێن مراوی بەحری ئەشعارم
وەکوو پەروانە هەر شەیدای گوڵاڵە و باخ و گوڵزارم
وەکوو شەم هەر دەتاوێمۆ و لە تاریکایی بێزارم
خوڕەی چۆم و شەتاوان بۆم دەبێتە مۆسیقەی شادی
وەکوو لاولاوی تێک‌ئاڵاو هەتا دەمرم ئەویندارم
تریفەی بەفری هەوراز و نشێوی سینە تا مابێ
ئەویسنداری بەهار و گوڵ، دژی بێدەنگی شەوگارم
ئەگەر «ئاسۆ»ی ئەوینی من لە کاتی پیرییا تارم
ئەمن بۆ بەزمی خانەی دڵ بە ناڵە چەشنی سێ‌تارم

باغی میراوا ـ ٧٧/١١/٢٦

## ژیلەمۆ

لێم گەڕێن من ژیلەمۆی پەروانەیێ سەوداسەرم
تا بەدی کەم نووری عیشقێ ڕۆحەکەم دێتۆ بەرم
باڵەکانم دەبنەوە شاباڵی شیعر و هەڵفڕین
بووکی ئازادیم لەگەڵ دێ و خۆی دەبێتە ڕێبەرم
بەرهەڵستی ئاسنینیشم لە سەر ڕێ دابنێن
مستی پۆلام دایدەهێنێ تۆرەمەی ئاسنگەرم
لێم گەڕێن، چۆن پێم دەڵێن لای‌لای لە بۆ شەوگار بکەم؟
من کوڕی شەوقم ڕەواجی نووره بازاڕی سەرم
شەقڵی ماچی من لە سەر کولمی هەتاوا دیارە هەر
دەی چلۆن بێزم دەهێنێ گەر پەنا بۆ شەو بەرم؟
من گڵی دڵیان بە ئاوی عیشقە پێژاوم برا
بۆیە هەر ڕەش ئەسمەرێ دێ زوو دەبێتە دڵبەرم
سەد کەژاوەی کۆچی یارانم بەڕێ کردوون کەچی
بووکی بن تارای شیعر قەت هەر نەهاتە یاوەرم
تاوەکوو «ئاسۆ»ی خەیاڵی شەمعی ڕووی تۆم دەرکەوێ
من سەراپا دەبمە گڕ، نامێنێ شوێنی سێبەرم

بۆکان- ٧٤/٨/٢١

## یاد

چۆن هەتا هەم ڕەش نەپۆشم، کوانێ هـاوڕازی دڵـم؟
کێ لـە پـاش تـۆ ژیـر دەکـا منداڵـی بـێنـازی دڵـم؟
هەوری غەم ئاسمـانی شـادیمی ڕەش و تـار کـردووە
کێیـە غـەم دەکـرێ بڵـێ گـوێ بداتـە ئـاوازی دڵـم
خەڵکی چاوەڕوانی ساز و شـیعر و ئاهـەنگـن لـە مـن
داخەکەم کەس گـوێی نـەدایـە سـازی ناسـازی دڵـم!
کۆچی تـۆ ئاهـەنگـی فرمێسکی دەوێ چـۆنی بڵـێم؟
چـۆن بـدرکێنم لـە دووری تـۆ بـە تـۆ ڕازی دڵـم؟
بولبولی شادی و ئەوینم! بۆ بەجێـت هێشـتم لـە ژیـن؟
وا بـــەرەو ڕۆژپـــەڕ فـــڕی شاباڵـــی شـــابازی دڵـــم
هەرچی دەزگای مووسیقایە سووکە بۆ قورسیی غەمم!
جا مەگەر هـەر خـۆم بـزانم مـەرسـییەی جـازی دڵـم
من لە «ئاسۆ»م پرسی ئەحواڵی دڵی، ئـەو پێـی کـوتم:
چۆن هەتا هەم ڕەش نەپۆشم، کوانێ هـاوڕازی دڵـم؟

بۆکان_ ٧٧/٨/٤

بە یادی تۆوە ئەمشەو چاوەکەم کاریزە دەڕوانم
لە ئاسمانی ڕەشی شەوگاری ئەم تەوریزە دەڕوانم
لە ژێر هەور و برووسکەی ڕێژنەبارانێکی ناوادە
لە چاوقرتاندنی ئەستێرە بەم لەنگێزە دەڕوانم
لە تاریکی و تەم و بێدەنگی هیچ باکم نییە؛ ئەمما
لە ڕۆژ و تیشک و ناڵەی دڵ کە چەن بێڕێزە دەڕوانم
بە یادی تۆ خەیاڵی مانگی تابان، یاس و ڕێحانەی
گەلێ شیرینە؛ ئەمما وەک پەلی شەودیزە دەڕوانم
هەناسەی لێ بڕا هەستی ئەویندارانی ئەم خاکە
لە هەودای بیری شیعراویم کە چەن بێهێزە دەڕوانم
بەڵێنم داوە باسی دەردی کورد و کۆیلەیی ناکەم
ئەدی لەو پەنجەرەی وا خۆر لەوێ ئاوێزە دەڕوانم
شەوی قەترانییە مەڵبەندی »قەتران« بۆیە تا مردن
لە «ئاسۆ» ڕوونی سبحەینێ پلەی ئاریزە دەڕوانم

٢٣ی ڕەشەمەی ٧٤ـ تەوریز ـ نەخۆشخانەی مێهر

## گەرداڵ[1]

ئەگەر شەوقێ لە بەدری سینەکەی تۆ دێتە بەر چاوم
دەڵێی ماسی شەپۆلی سینەتم بەو شەوقە تاساوم
مەلێکی لانەوازم، هەر شەوێ دارێکە هێلانەم
لە ترسی تیری تانەی باغەوانان سەیرە چۆن ماوم
وەکوو گەرداڵی بەرنووری ئەوین هێند سووک و بێ‌کەس مام
لە هەوران تێپەڕیم، ئیدی چ بوو وا سووک و بەدناوم؟
شەماڵی مەیلەکەت لە کوێیە؟ وا زستانی پیری هات
دەڵێی زوقمی خەمت نیشتۆتە سەر سەر، گەرچی هەر لاوم
دڵم وەک چۆلەکەی بێ‌پەل لە نێو هێلانی سینەمدا
دەلەرزێ تا هەڵۆی بیر و خەیاڵت دێنە سەر ڕاوم
ئەگەر پەیوەندی بەو زولفەت نییە ئیحساسی شیعری من
لەبۆ وەک زولفی تۆن هەستم، دەمێ کرژم، دەمێ خاوم؟
وەکوو ئەو شیعرە «ئاسۆ»ی لاوەتیشم دێتەوە هەووەڵ
«ئەگەر شەوقێ لە بەدری سینەکەی تۆ دێتە بەر چاوم»
بۆکان- هاوینی ٧٣

---

١) زەڕڕە ـ تۆزقاڵ

دەمـــــەو ئێـــوارێی پـــاییزە و مـــــن مـــات و دامــــاوم
لـــە ئاســـۆ ڕادەمێـــنم شکڵـــی تۆیـــە دێتـــە بـــەر چـــاوم
هـەور وەک ڕووسـەری پـەڵـکەی هـەتـاوی زەردی داپۆشـی
کـەچـی تـەڕتـر دەبـێ مـەزرای خـەیاڵـی بـێ نـەشـە و خـاوم
خـــەیاڵـــی چـاوی کاڵـــی تـــۆ نـــەبـــێ میـــوەی شـــیعر ناگـــا
هـــەناســـەم ســـوور دەکـا بێســـتانی شـیعری شـەختـەلـێدراوم
کە نسکۆش بێتە بەر پێی من بە سوجدەی دابنێ بۆ خۆت
کـــە تـــۆپـــارێزەرم بی کوانـــێ ترســـی کـــەوتی ناکـــاوم؟
ئەوا سوور هەڵگەڕا ئاسۆ و سوروشت وەک کوڵمی تۆی لێهات
مـەل و مـۆر چـوون بـەرەو هێلانـەیـان و مـن تـەنـێ مـاوم
چـــەنـــێ ئێـــوارەیـــێ جوانـــە خـــەیاڵـــم ڕەنگـــی تـــۆی داوە
وشـەی جـوان وەک پـەپوولـە دەوری گوڵـزاری قسـەی داوم
لـە خـۆ بـایی نـەبی گیانـە! ئـەمـن تـۆم کـردە گـوڵ بـۆ زار
بـە بـێقـەدری بـە لامـا ڕامـەبـووریٚ چـاوەکـەی چـاوم!
هـــەتـــا «ئاســـۆ» بمێنـــێ کـــاتی ئێـــواران وەکـــوو جـــاران
لـــە ئاوێنـــەی شـــیعردا دەتنوێنـــێ جـــوانی بـــێنـــاوم

تەورێز/ بۆکان- ۸۰/۸/۲٤

## غەریبە

مـن لـە ماڵـی خـۆم غـەریـبم، بـێ کـەس و بـێ‌چـارە خـۆم
دەک بـە دەردی دەس‌تـەزیـوی زۆرپـەڕی ئێـوارە خـۆم
کوانــێ ئــەو یارانــە وا گشــت ئاشــنا بــوون بــۆ دڵــم؟
ئــاخ لــە بــۆ دەردئاشــنایێ! تــا ئــەبــەد ئــاوارە خــۆم
شـەمعـی ڕوونی چـاوەکانـت ڕوون دەکـەن کووچـەی دڵـم
تـۆم نـەبێ شـێت و غـەریـبی شـەوگـەلی ئـەم شـارە خـۆم
پــڕ بــە «کوردســتان» دەناڵــێنم کــە چــۆن شــێوا گوڵــم
ئــەی بــە تــەنیــا عاشــقی ئــەو بــەژنــە ســێبەردارەخــۆم
هـەسـتی سـرکی نیونیگـا دەخوێنمـەوە بـێ ئـەلـف و بـێ
دەک بــە ڕیســوای نیونیگــای ئــەو چــاوە پــڕئازارە خــۆم
دەرکی هـەر ماڵـم کـە لێـدا یـەک خشـەی پێم بۆ نـەهات
خـۆم گـەدای بـێ نـان و ئـاوی جـل‌شـڕی سـەدپـارە خـۆم
تــاکوو جۆبــاری ئــەویــن ئــاوم بــدێرێ بــۆ ژیــان
وەک بەڕووی کوێستانی کورد سەرسەوزی ئەم جۆبارە خۆم
نابــەزم، لــێم ڕوونــە «ئاســۆ» ڕۆشــنە وەک شــیعری تــۆ
خۆش‌خەیاڵی بەر ترووسکەی شەمعی ئـەم شـەوگـارە خـۆم

بۆکان- ٧٦/٦/٧

هێند دڵم تەنگە دەڵێم بەم شەوە لەم شارە بڕۆم
لە وڵاتێ کە جەفا حاکم و سالارە بڕۆم
نە وەفا لای کەس و کارە و نە سەفای ماوە ژیان
با لە دەس بێبەزەیی هەر چی کەس و کارە بڕۆم
نە گوڵستانێ دەبینی، نە گوڵێ پێدەکەنێ
شەرتە لەو شوێنە کە بولبول قەفەسی خارە بڕۆم
خۆشترین دەنگی شەوانەم غەزەلی ڕەنج و غەمە
لێم گەڕێن با بە غەمینی منی بێچارە بڕۆم
کێ دەزانێ چ لە نێو ئەم دڵەدا ڕادەبرێ؟
خۆزگە بەو ڕۆژە بەتەنیا وەکوو ئاوارە بڕۆم
دەوروبەر چەشنی نەخۆشخانەیە، دوکتۆرێ نییە
شەرتە لەو جێگە کە دەرمان هەموو وەک ژارە بڕۆم
چونکە زۆرداری بەرەندەی گرەوی ئەم گەلەیە
عەهدە لەو جێگە بە دەس تاقمی بێعارە بڕۆم
یارمەتی دا کەسێ «ئاسۆ» لە دەس ئەم ژینە دەبا
تاکوو ئەو شوێنە ئەوین سەروەر و سەردارە بڕۆم

بۆکان- هاوینی ٧٧

## دەسنویژی شیعر

خـەزانـە و زەرد و غـەمگیـنن چـەمـەنـزار و بـەراو و دێم
لـە ئـەم وەرزی وەرینـەیـدا کـەسـیرە و عـاجز و بـێجـێم
دەڵـێی ئـەم تـاوە بـێتینـەش نـەمـاوە تیشـک و تیرێـژی
کەوا من سـارد و بـێتیـنم، ئـەویـش گـەرمـایی نـادا پـێم
مەکەن مەنعم، لە دەس ئەم چەرخـە سپڵـە گـەر دەناڵـێنم
ئەوەی هۆی ڕۆشنی دڵ بێ بە جارێ گشتی ون بوون لێم
لـە ژێـر باڵـی پـەریشـدا هـەسـتی ئـازادی بـەدی ناکـەم
ئیشارێکم هـەبـێ بـەسمـە، کـە ئـازادیش نـەبم هـەر دێم
پەریلەی هەستی دڵـداریم! غـەریـبی چـاوی کاڵـی تـۆم
چرای چاوت نەبێ ڕێگا بـەڵـەد نـیم، دیـار نییـە بـەر پـێم
کـە دەتبیـنم تـەزووی هـەسـتی ئـەوینـت وام دەچۆقێنـێ
دەڵـێی منداڵـی بـێبـەرگـی دەمـی سـەرمـاوەزی لادێم
هەتا تین و ئـەویـنی خۆشـەویستی شـک بـەرم، شـەرتـە
لە سەر ڕێی سەخڵەتی ژیندا بە موویـێ لانـەدەم لـەم ڕێم
بە کوردی گۆچ کراوە چون زمانی شیعری «ئاسۆ» کـەت
هەتـا دوارۆژی ڕووناکمـان بـە لـەبـزی موکریـان دەدوێم

بۆکان ـ ٧٧/٧/٢٠

## لە کوێستان

قەتارەی قافیەی گوڵ دێت و من سەوداسەرێ بەسوێم
دەبەستن دەست و پێی هەستم کەمەندی تووڕەیی هاوڕێم
خەڵک پێی وایە من خەتمی کەلامی عەشقی تۆم کردوون
کەچی نازانن ئێستاکەش لە ئەووەڵ حەرفی ئەلف‌وبێم
لەبەر خاڵ‌خاڵی کوێستانان خەت و خاڵی گوڵان ون بوون
منی مەجنوون کەچی هێشتا بە یادی خاڵەکەی لەیلێم
لەبەر هاڕەی شەتاوان دار و بەرد گوێی کەڕ بووە لێرە
کەچی بۆ بیستنی سۆزەی ئەوینی تۆ سەراپا گوێم
چنار دەنوێنێ باڵای و، نەمامی شۆڕەبی پرچی
بە هاژەی ئاوی بەفراوان هەموو خەملێن بەراو و دێم
منی گۆشی چەم و ڕۆبار و هاڕەی سەر شەتاو ئێستا
وەڕەزبووی هاژەیی شارم، نەشەی ساکاری کیژی دێم
دەڵێن پێم بۆتە مامۆستا کەچی لێرانە شاگردم
کەسێ تا ئێستە نەیناسیم، ئەرێ یاران بڵێن من کێم؟
بەڵێ «ئاسۆ»ی هەژارانی گەلی دێ کاول و خۆشم
بەرەو ئاسۆ دەڕۆم تا هەم، هەتاکوو مابێ هێزی پێم

گوندی قوڵقوڵەی خاپوورکراوی کوێستانی بانە- ٧٤/٢/٢٢

## باخی ڕەنگ‌زەرد

چاوەکەم کوا من غەریبم؟ ئاشنام، بێگانە نیم
پیری عەشقی لاوی تۆم وام تێمەگە، فەرزانە نیم
ڕاستە من سووتاوی ڕووتم تۆ وەرە نێو باغی دڵ
تا بزانی بۆ گوڵی ڕووت بولبولم، پەروانە نیم
باخی ڕەنگ‌زەردی خەزانی کێ دەڵێ زەوقی نییە؟
من بە زەردیش سەوزە هەستم، گیانە لەو باغانە نیم
باڵ و پەڕ سووتاوی دەردی بێ‌کەسی و دووری شەمم
کێ دەڵێ لەم عەسرەدا ئەمنیش وەلی دێوانە نیم؟
هەست و بیر و شیعر و فیکرم تێکەڵی ڕەنج و غەمە
بۆ خەمی گەل من سەراپا عەینی داوم، دانە نیم
تاکوو بشکێنم قەفەس هێزم دەیە بۆ هەڵفڕین
وێڵی ئازادیم ئەمن قەت خەڵکی ئەم وێرانە نیم
چاوی تۆ میهمانی ماڵی چۆڵ و بێ‌تینی دڵە
خۆشە؛ ئەمما من شیاوی وەسفی ئەم میهمانە نیم
من هەتا «ئاسۆ»ی هومێدم تیشکی ڕووی جانانەیە
دڵنیام پاش مردنیشم کۆتەڵ و ئەفسانە نیم

ساروقامیش_ ٧٥/٨/٢٢

## یاساغ

بـۆ مـنی ئـەهلـی خـەیـاڵ ئێسـتە خـەیاڵـیش قـەدەغـەن
سەیـری بێسـتان و شـەمامـە و بـەیـی کاڵـیش قـەدەغـەن
خۆ چەلان چا بوو بە یەک شووشەیی گەردن نەشە بووم
ئێسـتە ناشـوکری نـەبـێ شووشـە بـەتاڵـیش قـەدەغـەن
بـە سـەرنجێـک و بـزەی ڕەمـزی هـەواڵـی دەگـەشـام
چ بکـەم ئێسـتاکە سـەرنجیش و هـەواڵـیش قـەدەغـەن
بقـە بـوو سـەهمـی منالّـی و دەمـی لاویـش دەمـەکـە
بـە قسـەی ئـەهلـی مـەکـە بـیری منالّـیش قـەدەغـەن
نـە هـەناسـەی سـەحـەری فێنکـی ئـەدا پـێم، نـە شـیعر
داخەکەم ئێستەکـە خـۆ سیحری حـەلاڵـیش قـەدەغـەن
شەربەتی خەنـدەیـێ شـیرین بـوو دەوای خوسـرەوی دڵ
دڵــی بێکــەس چ بڵــێ شــەربــەتی تاڵــیش قــەدەغــەن
پـێم دەڵـێن کۆنـەیـە ئـەم وێنـەیـە، ناڵـەم چـی بـرا؟
چونکــە ئێســتا غــەزەلی شــیوەیــی ناڵــیش قــەدەغــەن
چۆلـەکـەی بـاڵ و چـەقۆیـە خـەمـی شـیعرێ، «ئاسـۆ»!
ڕوو لە کوێ کا وشە؛ چون ئێستەکـە باڵـیش قـەدەغـەن!

زانکۆی تەورێز ـ ٧٦/١١/١٥

## ئای کە ...

بۆ هاوڕێم: سەید عەزیز محەممەدی

ئای کە ئەمشەوکۆتری سرکی وشەم چۆن ڕەو دەکەن!
ئای کە ئەمشەو چاو چلۆن فرمێسکی دووریت کەو دەکەن!
ڕۆح و فیکر و دڵ هەموویان چاوەڕێی تۆ بوون؛ بەڵام
چونکە چاو نەیدیت هەموویان شیوەنی خۆ بەو دەکەن
ئەی پەریزادی ژیانی عەشقی ئەفسانەم! لە کوێی؟
تانوپۆی هەستم خەیاڵی ئەو خەمەی ئەمشەو دەکەن
داوەتی ئەستێرە بوو ئەمشەو لە جێژوانی خەیاڵ
تۆ نەهاتی، تازە چۆن ئەستێرە تا ڕۆژ خەو دەکەن
دەسخەتی پاکی خودایە دەفتەری ڕوخساری تۆ
ئەو کەسانەی چاوی لێ ناکەن بەعەمدەن، سەو دەکەن
مورشیدم، تاوانی من هەر خۆشەویستی بوو لە ژین
بەم گوناحە «پیری دەسگر» کوا زەمی «ڕێڕەو» دەکەن؟
گەرچی ئەمڕۆش سووچی حەقوێژی وەها سەرداریە
ئەو کەسەی بێدارە چاوی پڕ لە زیخ و چەو دەکەن
هەر بە «سەجعی» دەنگی تۆ بوو شیعری «ئاسۆ» هاتە ناو
بۆیە وێنەی شیعرەکانی هەر لە شیعری نەو ئەکەن

بۆکان- ۷۳/۱۰/۲۹

## لە بێستوون

گەر بە کێوی بێستوون شیرین لە عاشق ون دەکەن
تیشەکەی فەرهادی عەشقیش بێستوون کونکون دەکەن
خەسرەوانی ئەم خەراب‌ئابادە بۆوان دائیمەن
عاشقی ڕاستی حەواڵەی ژوانی پێش مردن دەکەن؟
شوورەیی بۆ ئەو کەسەی شوورەی دەکێشێ بۆ ئەوین
چاوی شیرین یەک نیگای دار بۆ قەڵای ئاسن دەکەن
چاوەڕێی ئاوڕێکی تۆم من بۆیە ڕۆحم بێ‌وچان
ئارەزووی دەریای دوو چاوی بێ سنوور و بن دەکەن
لەم شەوەی ئەنگوستەچاوە نووری هیوای تۆ نەبێ
گوڵپەڕی سەر لێو نیشانەی تووڕەبای تۆسن دەکەن
من لە دەرزی پەنجەرەی چاوی ئەوین دەڕوانمە شەو
بۆیە بۆم ئەستێرە کاری سەد چرای ڕۆشن دەکەن
عاشقی دەرمانی دەردی ڕۆحی خەستە و تینووە
ئەو کەسەی هەستی هەبێ «ئاسۆ» لە ژین وەک من دەکەن

کرماشان- ٧٣/٦/٢٥

## پرسیار

ئـەم گـەڵا سـەوزانـە بـۆچی زەرد ئـەبـن؟
تووشی ساردی و هەڵوەرین و دەرد ئەبن؟
تــا چــرۆن تۆفــان و تــەرزەی دوژمنــە
هەر کە پشکووتن بـە گـەرما زەرد ئـەبـن
بوون بـە گـوڵ تـا بولبولێکیـان دێتـە سـەر
تووشــی پلــلاری هــەزار نامــەرد ئــەبــن
مــن لــە پــاییز تــووڕە بم بــێحاسڵــە
شووشەکان هەر ئاخری تووشی بەرد ئەبن
هەر کەسێ سەوزی بوێ زەردیـش ئـەبێ
زەردەکـانن تـا ئـەبـەد هـەر زەرد ئـەبـن
جۆگــە ئــاو ڕۆیــی ئــەبــەد نایێتــەوە
ئاوی دەستی یـارە وەک کـەوسـەر دەبـن
کامـە شـادی و دەردە هـەر کۆتـایی دێ
گشـت لـە بـەر تیکـرارە زەجـراوەر دەبـن
غــەیــری داری بــاغی دڵــداری نــەبــێ
عاقیبـەت گشـت دارەکـان بـێبـەر دەبـن
ئــەو شــتانەی ســابیتن «ئاســۆ» لــە ژیــن
شـیعر و ئـەشـقن جاویـدانن، هـەر دەبـن

ساروقامیش- پاییزی ٨٥

یـارۆ دەیـەوێ سـابتی کـا گـەر نـەتـەویم مـن
کام گەل بـە هونـەر زینـدووە بـا بزانـێ لـەویم مـن
خـەڵـفی نـەتـەوەی مـادم و لـەم خاکـە چـەقـاوم
دوژمن! بە غەڵەت تێمەگە! کەنگێ عـەلـەویم مـن؟
ئـەسـتێرەیـە هاواڵـی خـەیاڵـم بـە خـەیـاڵات
شاباڵـی گـڕم پێیـە کـەچـی هـەر لـە زەویم مـن
ئـەم خاکـە مـەکـۆی فیتنـەیـە، ئـەمبـاری درۆیـە
باڵـم لـە قـەفـەز هـەڵـپڕووزا، بۆیـە کـەویم مـن
مـن گـەرچـی ڕەقیـبم نییـە؛ ئـەممـا ئـەوە بـەرزە
یار چاوی لەوە و هەر ئەو سەربەرز و نـەویم مـن
چـەن مـەرزی وڵاتم لـە بـەری پێیـەوە هێشـتا
بێهوودە لـە بـەر پێم دەتـەنـن، ئـاوی شـەویم مـن
تـا زینـدوو بـە عاشـیرەکـەتم زەندییـە ڕیشـەم
بـەو سـەفسـەفی بـرژۆڵ و برۆتـدا سـەفـەویم مـن
یار پێم دەڵێ: تۆ چاو و دڵت تەڕ نەبێ وەک یەک
پـەیمانـە کـە پـڕ بـوو دەڕژێ، بـۆ سـەنـەویم مـن؟
ئاسۆی خـەمـی ئـەم خاکـەم و عاشـق بـە هـەتـاوم
خاکم بە ئەوین تەڕ بووە جا بـۆ مـەگـە چیم مـن؟

باغی میراوا ـ ٧٧/١٢/١٧

## نەزەر

ئەی دڵ وەرە با لەم شەوە دەیجوورە سەفەر کەین
تەرکی خەم و ترسی هەموو ڕێیێکی خەتەر کەین
با هەرچی گوڵی جوانە لە ئەلبۆمی دەرێنین
بەرماڵ بن و مەش سوجدەیەکی سەهوی لە سەر کەین
ئەو دەرسە درۆیانە پێیان دیکتە دەکردین
بسڕینەوە، جا دەرسی ئەویندارى لەبەر کەین
دونیا وەکوو بازاڕە، گرانی هەدەفە و بەس
هەرزان بە جەهەندەم ئەگە سەرپاکی زەرەر کەین
حەیوانسیفەتی بەسیە، بەشەردۆست بە هەتا هەی
با لەحزەیەکیش خزمەتی ئاواتی بەشەر کەین
بەستمانەوە هێند خوار و خلیچ مێزەری پڕ پێچ
پێچێکی بەڕاستی کە شیاومان بێ لە سەر کەین
سۆفی دەڵێ چاوت لە شتی جوان مەکە قەتقەت
ئەی دڵ! وەرە با لەم نەزەرەی سەرفینەزەر کەین
خوا جوانی دروست کردووە، کوا جوانی خەتای خۆی
زۆر ناحەزە گەر ئەمن و ئەتۆ بەحسی لە سەر کەین؟
ناحەزینە با وەک «ئاسۆ» لە قەڕنی یەکویستا
بەرگی غەزەلی فیکری تەڕ و تازە لەبەر کەین

ساروقامیش ـ ٨١/٩/١

## فەرمان

پێی کوتم مەگری لە بەر دەردی ئەوین، پێم کوت بە چاو
پێی‌کوتم عاشق بە وەک فەرهادی چین، پێم کوت بە چاو
پێی کوتم عاشق دەبێ ڕازی ئەوینی خۆی نەڵێ
وا نەبێ ئەو شادییەی دەکرێتە شین، پێم کوت بە چاو
پێی کوتم تا ڕۆح لە ڕێی عەشقا بە هەرزان دانەنێی
قەت بە مەم ناگەی منیش تا بم بە زین، پێم کوت بە چاو
پێی کوتم پەروانە بە سووتان و جێژوانی لا یەکە
بۆ ئەویندار هەر یەکە خەندە و گرین، پێم کوت بە چاو
پێی کوتم پێت خۆشە ناوت بەرز و بدرەوشێ لە دوور؟
دور بە لەو شەخسانە وا سەریان نەوین، پێم کوت بە چاو
پێی کوتم سەر با مەدە ساقی کە بادەی دایە دەست
بێ ترس بیخۆرەوە و جا بگرە تین، پێم کوت بە چاو
پێی کوتم کاڵێ! دەبێ بکوڵێی بە تیشکی چاوی یار
خۆت نەخەیتە گۆمی قووڵی چاوی شین، پێم کوت بە چاو
پێی کوتم تا خاکی کووچەی ئێمە لات گەوهەر نەبێ
زەحمەتە ئەمن و ئەتۆ بۆیەک ببین، پێم کوت بە چاو
پێی کوتم «ئاسۆ» دەبێ قەت باسی عیشقی من نەکەی!
لێ نەدەن با تەپڵی ڕیسواییت بە قین، پێم کوت بە چاو

بۆکان- جێژنی ڕەمەزان- ٨١/٩/١٥

## لاسایی قورڕەتولعەین

بێت و خودا ڕەحمی هەبێ بینمەوە جارێ چاوی ئەو
دێتەوە تافی لاوەتیم، لەحزە بە لەحزە، شەو بە شەو
دەچمەوە لای هەرچی مەلی چریکە دارە بۆم بڵێن
قومری بە قومری، پۆڕ بە پۆڕ، بولبول و سێرو کەو بە کەو
بۆ مەگە یادی چاوەکەت ساتێ وەلا دەچێ لە دڵ؟
لەحزە بە لەحزە، سات بە سات، ڕوئیا بە ڕوئیا، خەو بە خەو؟
دەرکەوێ با داخی دڵی شاعیری ئاوارەیی گەل
تازە بە تازە، کۆن بە کۆن، کۆنە بە کۆنە، نەو بە نەو
هەرچی دەماری هەستمە بە یادی تۆوە لێدەدا
جمگە بە جمگە، ڕەگ بە ڕەگ، قوڵفە بە قوڵفە، گەو بە گەو
تەزبیحی ئارەزووی دڵم بگرەوە بەو بسکەتەوە
خڕکە بە خڕکە، زیخ بە زیخ، دانە بە دانە، چەو بە چەو
ڕازی ئەوینی شاعیریت «ئاسۆ» لە شار دەگێڕنەوە
کووچە بە کووچە، ماڵ بە ماڵ، هاوسێ بە هاوسێ، ئەم بە ئەو

بۆکان- پاییزی ٦٤

## «تاسە»

**«پێشکەش بە هاوڕێی شاعیرم کاک عومەری ڕەسووڵی**
**کە شیعری من بە دەنگی ئەو فرچکی گرت»**

«من بە دەریای تاسەوە هاتووم بەرەو دیداری تۆ
تۆش بە کێوی سەبرەوە ئێژی: چەلێ لاچۆ بڕۆ»[1]
چاوەکەم من تاسەباری جارێ لێ‌پرسینتم
مەیلی سەد لەیلم دەنێم کاتێ دەبینم چاوی تۆ
کێ بە قەد تۆ حاڵییە لەو دەردی عیشقەی ڕۆحی من؟
تۆ دەکەی هەستی خەیاڵی عاشقانی دڵبەسۆ
ئەو دەمەی جێم دێڵی ئاخر قەت دەپرسی حاڵەکەم؟
ڕۆحی من هەنگاو بە هەنگاو پێت دەڵێ: «تۆ خودا مەڕۆ!»
گەرچی هەر وایە ژیان، ئاکامی هەر ڕۆییشتنە
بای جودایی پەرچەمی سەد مەجلیسی کردە پەڕۆ
کوا «حەسەن»؟ دەنگ و چریکەی ئاشنای ڕۆحی مە بوو!
تازە وەک بێگانەیێ بۆمان دەڵێ ئەو «نا مەچۆ»
نا مەچۆ، گیانە مەچۆ، یاری عەزیزی من مەچۆ
ژین فەقەت مانای ئەمانەن: «هەست و عیشق و ڕەنگ و بۆ»

---

١) ئەم بەیتە هی کاک عومەری ڕەسووڵی مەهابادە.

## دەسنوێژی شیعر

خۆت دەزانی وا لە نێو باغی گوڵا مزگەوتی من
نوێژ بەرەو قیبلەی دڵی خۆم دادەبەستم هەشت و نۆ
چۆلەکەی تەبعی نزارم کوانێ هێلانەی هەبوو؟
تاکوو دەنگی ئاشنای گەرمت وەکوو باڵی هەڵۆ
بردییە تەشقی ئاسمان و چاوی بینا کردەوە
شەرتە «ئاسۆ» تا هەبێ شایی بە تۆ بێ نەک بە خۆ

بۆکان- ٢/١٠/٧٧

## زیندانی غەزەل

لەو ڕۆژەوە ئاوا کە لە من بێخەبەری تۆ
سەر بۆتە زیادی لە سەرم سوێند بە سەری تۆ!
پرسیم لە نەسیم شوێن و هەواڵت؛ کەچی دیتم
ئەو مەستە لەبەر بۆنی قژی گوڵعەمەری تۆ
سەد خۆزگە بزانی کە چەنێ تەنگە دڵم بۆت!
من چەندە گوناحم؛ کەچی چەن عیشوەگەری تۆ!
وەک ئاسکی هەڵاوارده هەموو شوێنێ دەنۆڕم
خۆڵم وەسەری، هیچ نییە شوێن و ئەسەری تۆ!
دەستەنگی ئەمن قەت مەکە هۆی ڕەحمی ئەوینت
دەستم بەوە دەشکێ کە نەگاتە کەمەری تۆ
تۆ بەندەری و من بەتەمای بەندی ئەوینت
زیندانی غەزەل قەت نییە جێی جیلوەگەری تۆ
تۆبازی «خوڕێنکی»[1] و لە ئوڕووپایە دەکەی ڕاو
ئەی خۆم بە نەچیری دەس و پەنجەی خەتەری تۆ
ئاسۆ! وەرە لەم عەشقە گەڕێ تۆ بی خوداکەت!
تاکەی بەتەمای عیشقی وەها بێسەمەری تۆ؟

بۆکان_ ٧٨/١/١٤

---

١ - خوڕێنک: شوێنێکە لە حەوزە گەورەی بۆکان.

## بۆ مامۆستا حەقیقی

«سەبا» هەستە دەخیلم، چون بەریدی عاشقانی تۆ
پەیامی من بەرە بۆ ئەو موراد و مورشیدەی «ئاسۆ»
بڵێ چی دیوە لێم وا قەت نەبوو جارێ بپرسێ لێم؟
لە منڕا پێم خەتایە یان دڵی ئێشاوە لێم ئاخۆ؟
چییە بۆچ لائەقەل نایێتە خەونم جارێ ببینم؟
بڵێی لایق نەبێ کەللەم لە بۆ گۆچانەکەی وەک گۆ؟
بڵێ پێی: ئەی «حەقیقی» کانی ڕەحم و لوتف و دینداری
دەزانی چۆنە حاڵی من لە غوربەتدا لە دووری تۆ؟
ئەرێ تۆخوا وەکوو جارانە ئێستەش ژووری پڕ نوورت؟
وەها هەر دێنە لات ئەربابی شیعر و ئەهلی دڵ کۆکۆ؟
دەزانی چۆن بە تیری "دوورەتۆیی" تێکشکا باڵم؟
مەلی عیسام و شەوگەردم، لە ڕۆژی ڕوون بووم نامۆ
مەگەر یادێکی تۆ لەم حاڵەدا فریام کەوێ ئەینا
تەرەبخانەی دڵم لێی نایە دەنگێ غەیری شین و ڕۆ
چلۆن «ئەحمەد» بەبێ من دێتە لات و نایە فرمێسکی؟
کە من ئێستا لە دووری ئەو دوو چاوم لێڵ بووە و کەمسۆ
بە یادی تۆوە باوەڕ کە لە ئێرەش لێ ئەدا نەبزم
حەقیقی، پیری عیرفانم! مورادم! مورشیدی «ئاسۆ»!

سەبزەوار / ٦٨/٩/١٥

## جوابی مامۆستا حەقیقی

بە فیدای بم «سەبا» هێنای پەیام و شیعرەکەی «ئاسۆ»
بە تەرزێکی لە میسرێڕا لەبۆ کەنعانی هێنا بۆ
وەهای ڕوون کردەوە چاوم جەواهیر سورمەکەی لوتفی
ئەشەعەی لێزەرێ پێی ناکرێ بەم جۆرە شوستوشۆ
ئەوا دووبارە ساڵی دووبەهارم دی، دەنا کێ دی
لە پاییزدا گوڵی لالە و هەڵاڵە و سوێسنە و شەوبۆ؟
برا بەینێکە دووریم لێ دەکەن دۆست و ڕەفیقانم
لە دەورم ڕەو دەکەن یاران دەڵێی هەڵدێن لە دەست ئاهۆ!
لەوێ دەمڕا کە لێم دووری لە یاران دوورە دیدارم

لە «مەولانی»[1] دەپرسێ چەن ئەتۆم دیوە ئەویش ئەوتۆ
ئەتۆی گۆچانەکەی دەستم، ئەتۆی ڕاکێشەری هەستم
ئەتۆی بۆ ژانی ناسۆری دەروونم مەڵهەم و بۆسۆ
وەرە با بۆت وەگێڕم نەقڵی کۆلێلی[2] برادەرمان
لە پاشی ساڵ و نیوێکی کە دیتم تێکی نا ئەبرۆ
ئەگەر نەختێ وەفا مابێ لە کن دوو سێ کەسان ماوە
یەکێکیان ڕەسوە سووتاوە[1] و ئەوەی دی سەییدە[2] و «ئاسۆ»

---

١) مەبەست کاک ئەحمەدی مەولانی شاعیر و نووسەری بۆکانییە.

٢) مامۆستا مەلا عومەر ساڵحی ساحێب شاعیری گەورەی شاری سەقز.

«حەقیقی» ئارەزووی جارانی هەر دیداری یاران بوو
که ئاواتی[3] له دەس دەرچوو، به کێ دڵ خۆش بکا ئەمرۆ؟
حەقیقی

---

١) کاک ڕەسووڵی کەریمی ناسراو بە سووتاو شاعیر و دەبیری فیزیکی دەبیرستانەکانی شاری سابڵاغە.

٢) مەبەست مامۆستا سەید عەبدولقادری سیادەت کوڕی مەرحوومی حاجی بابە شێخی تورجانە.

٣) «مامۆستا سەید کامیل ئیمام زەنبیلی» ناسراو بە «ئاوات» شاعیری هاوتەمەن و میللی کوردوستان کە لەگەڵ مامۆستا حەقیقی زۆر نێوانیان خۆش بوو. لە کاتی نووسینی ئەو جوابەی مامۆستا حەقیقیدا بەتازەیی لە دونیا دەرچووبوو.

خۆزگـە بـەو ڕۆژانـە وا قیبلـەی ئـەمـن بـوو چـاوی تـۆ
شـیعری مـن ببـووە نچـیری داوی زولفـی خـاوی تـۆ
سەدهەزار دەردی گرانم سـەددی ڕێ بوایـەن بـە کـۆڕ
پاکی ڕێک‌وپێک دەبوون هەرتاکوو دەم‌بیست ناوی تۆ
ماڵەکەت کەعبەی دڵم بوو، جێی تـەوافی ڕۆژ و شـەو
قوفڵی دەرکەی شادی من بوو پەنجەرەی بەسراوی تـۆ
ئێسـتە سـرکی و داوی ئاڵـۆزی خـەیاڵـم نـاتگرێ
هـەر مـنم گـەر دێمـە سـەر تـۆڕ داوی ئاڵـۆزکاوی تـۆ
من وەکوو ڕاوچی کەسیرە و بێ‌نەچیری گۆی چـەمـم
هەروەکوو ماسی خزی نێـو بـەحـر و نێـو چۆمـاوی تـۆ
دارە بی تینـووی قومـێ ئـاوی شـەتـاوی عاشـقیم
تێم بهاڵێ چاوەکـەم، چـون وەک گوڵـی لاولاوی تـۆ
ڕاسـتە زەرد و زایفـن ئیسـتێ گـەڵای لاوی ئـەمـن
هێندە هەستم هەن بە پێی خۆم بێمە ڕاوگـەی ڕاوی تـۆ
بۆیـە «ئاسـۆ» هـەسـتی هـەر وشـکاوی نایـێ پـاییزیش
ماوەیەک خوێندی لە باغچـەی پـڕ گـوڵ و ڕازاوی تـۆ

بۆکان_ ٨١/٦/٨

## یاد

خۆزگە بەو ڕۆژەی بە بادەی عیشقی تۆ دڵ شاد ئەبوو
بادە چی بـو؟ چـاوی تـۆ بـۆ خـۆی پیاڵـە و بـادە بـوو
لێـوەکانـت هـەر کـە هـەستێکی بـزەی هاتبایـە سـەر
دەرکی باخچەی شیعری تەڕ بۆ هەسـتم ئـاواڵا دەبـوو
وەی بە قوربانی خـەیاڵـێکی شـەوانـەت سـەد غـەزەل
هەر کە دەرکەوتبایە تیشکت سەد غەزەل ئامـادە بـوو!
مــاچ کــە هــەر تــاوانی زۆر گــەورەی ئێمــە بــوو
نازەکەت سەختی دەگرت لێم، خۆ دەنا زۆر سادە بوو
کوا لە زستانی تەمـەن ترسـم هـەبـوو یـا شـوێنی بـوو
هەر دەمێ هەستی ئـەویـنی تـۆم شـەماڵـی وادە بـوو؟
تـا لـە کـن تـۆوە مـەجـالی مـەرحـەبـایێکی هـەبـا
من لـە نـاو هـەستی دەروونم شۆڕشـێ بـەرپـا دەبـوو
ئێسـتە پاشـی سـێزدە سـاڵ ئـەو زامـە لـێم هاتۆتـە سـۆ
خۆت بە چاو ئاشیرەتت کرد، خۆ دەنا هـەر وا دەبـوو
سێزدە وەرزی ژیـنی مـن وەک دەربـەدەر بم تێپـەڕی
دەردی عیشقت لێم کەوێ وا دەردمی پـێ چـا دەبـوو
تۆ لە ڕێی عەشقی خودایی خۆت بەڵێت فەرموو، دەنا
تاکوو مردن جوابی هـەستی عاشـقیم هـەر نـا دەبـوو
ئیدی بۆچی بچمە دەر سەد سێزدە بێ؟ «ئاسۆ» دەڵـێ:
خۆزگە بەو ڕۆژەی بە یادی عەشقی تۆ دڵ شاد ئەبوو

بۆکان ـ ۷۸/۱/۱۳

کۆترێ سووک‌باڵ لە گوێسوانەم هێلانەی کردبوو
هەرچی ژەنگ و ژاری دەردی بێ‌کەسیمی شردبوو
خۆی دەزانێ و ئاگادارە عیشقی من کردیە هەڵۆ
تاکوو زانیم ئابڕووی سەر پاکی کۆتری بردبوو
ئەو وەکوو یەک نوختە بوو شیعری ئەمن کردیە عەدەد
پاک و باراشی جەزەی هیوای منی پا کردبوو
ئێستە زانیم لای گەلی کۆتر وەفا مانای نییە
من بە هیوای کۆمەکی بووم، غیرەتی ئەو مردبوو
من پلەی پەریان و پاکیم بۆ بە کادۆ بردبوو
ئەو مەترسی هاوڕەقیبی بۆ ئەمن هاوردبوو
وەک نە بای دیبێ و نە بۆران گوفتی خۆی بادایەوە
چونکە بۆنی عیشقی ئێمەی هەر دەڵێی با بردبوو
ئێستە بۆم سەلما ژن و ئەسپ و تفەنگ خێویان نییە
وەک نیشانە شیعری «ئاسۆ»ی بۆ تەڵە داکردبوو

سنە_ ٨٥/٦/٢٥

## باوەفاییێکم نەبوو

نەی وەکوو مـن قـەت نـەناڵـی، مـن نـەوایـێکم نـەبـوو
ئاشـــنای زۆرم هـــەبـــوون دەردئاشـــناییێکم نـــەبـــوو
کوا، چییان لێهات ئەوانـەی ڕۆشـنی دڵ بـوون لـەبۆم؟
لــــەو وەفادارانــــەدا مــــن بــــاوەفــــاییێکم نــــەبــــوو
سەد چرای هیوام لە شەوگاری خـەفـەتدا هـەڵـگڕاند
چـاوەڕێ مـاوم کـەچـی شـۆعلەی نیگـاییێکم نـەبـوو
هەر ئەمن سووتام و شـەم شـەوگـارمی ڕۆشـن نـەکـرد
لـەم شـەوەی ئـەنگوستەچـاوە قـەت چـراییێکم نـەبـوو
هـەڵـپڕووکاون چـرۆی ئـاواتی لاویم یـەکبـەیـەک
بێجگە ئاهی ساردی خـۆم سـۆزەی سـەبـاییێکم نـەبـوو
هەر چرای چاوێ کە تێیڕوانیم پەپوولەی دەوری بووم
عاشـقی ڕوونـیم[1] بڵـێم چـی مـن خـەتـاییێکم نـەبـوو
شـەو کـە حـاکم بێ فـەقـەت ئـەستێرە ڕوونـاکیدەرە
ئەی ئـەسـەف بـۆ مـن لـە ژیـنـدا شـەونمـاییێکم نـەبـوو!
وا بـەرەو «ئاسـۆ» فـڕین یـاران بـە باڵـی شـەوقـی یـار
هەر ئەمن جێ مام کە بـاڵ و دەسـت و پـاییێکم نـەبـوو

بۆکان_ ٧٤/١٢/٢٧

١) ڕۆشنی= ڕووناکی

## دوورە یار

دێ نەوای شاری لە گوێچکەم، من لە نێو باغم؛ کەچی
ئاشکرا دێم و دەنووسم شیعر و قاچاغم کەچی
دێ بە ڕۆحمدا شنەی دڵداری لەم عەسری غەمە
من بە پۆلووی هەستی ئاورینی ئەتۆ داغم کەچی
هەستی هیچ ئازار و دەردێکم نییە ژوور و دەرێ
هەر لە خۆڕایی و بەبێ تۆ مات و ناساغم کەچی
هێندە لێم دووری ئەوین و خۆشەویستی شەل دەبێ
بای شەماڵ دێ و پێم دەڵێ: مەئمووری ئیبلاغم کەچی
ڕۆحی هەردووکمان بە وێکڕا یادی یەکیان کردووە
تۆ لە سەنگاپووری ئەمشەو، من لە سابڵاغم کەچی
پەرچەمی زولفت لە سەر «ئاسۆ»ی ئەوینم خۆی چەقاند
چاو لە خاکی خۆم دەکەم بێ شاڵ و بەیداغم کەچی

مهاباد ـ ۷۸/۲/۱

## هاواری هەناسە

فریــام کــەوە ئــەی تیشــکی بــەیانــانی بــەهــاری
تــۆ نم‌نمــی بــارانی پــەڵــەی حــەیفــە نــەبــاری
ئێســــتا وەرە مەشــــکێنە دڵـــــم ڕۆحــــــی ڕەوانم
بــۆ چیمــی ئــەگــەر بــۆم ببیــە شــەمعــی مــەزاری
یــاڕەب ئــەوە کــازیوەیــە یــا ســینەیــە وا ســاف
یــا تیشــکی گــەلاوێــژە لــەوێ شــیوەنــە کــاری؟
زۆر تینــووە ئــەم تــەیــری خــەیــاڵاتی ئــەوینــەم
ئــاوی مــەدەیــە، تــۆ بی خــودا گــوێ بــدە وتــاری
هــاواری هــەناســەم بــەقــەدەر بــەژنی ئــەتــۆ گــرت
تــۆ چوویــە کــن ئــەســتێرە وو ئــەومــا بــە هــەژاری
ڕووی ژاڵــە سپی بێ کــە گوڵــی پــاییزە وەک تــۆ!
ڕوو زەردە وشــەی پــاییزە چــون تــۆی لــە کــەنــاری!
سەر مەستی خەیــاڵاتی شــەوێتــە و قــەڵــەمیش کــۆڵ
کوێســــتانی غــــەزەل ماتڵـــە تـــۆ بچیـــە هـــەواری
تــەی بــوو تــەمــەنی لاوییــەکــەم جــارێ نــەبــوو قــەت
ڕاست وەرگەڕێ بۆم، چەرخی ئەوین خوارە مەداری
مــن داری گــەڵا زەردم و ســەر ســەوز و دڵــم تــەڕ
تۆش ئەو مەلــە تیژباڵــەی ئــەگــەر چــەشنی قــەناری
یــەکیــەک قســەکانــت دڵــی «ئاســۆ» دەهــەژێــنن
مــن شێتی خــەیــاڵاتی و ئــەتــۆش شــوهرەیــی شــاری

بۆکان- ٧٧/٦/٢٠

# گریان

**ساڵڕۆژی لەدایکبوونی «وەفا» کوڕم**

هـەور وەک چـاوی مـن بـۆ بـێهـەوایـی نیشـتمان دەگـری
چنـاریش بـەو گـەڵا تـازەی لـە شـادی و خۆشـییان دەگـری
شەتاو بێئۆقرە ماوە، بـێوچـان وەک مـاری شـین دەخوشـێ
لە چیمەن هەر مەپرسە چۆن بـە شـەونم بـەربـەیـان دەگـری!
گـوڵان هـات و وڵاتـی کـردە تـارای سـووری خاشخاشـە
نـەچـی ئاشـق نـەبی گیانـە دەنـا دەردی گـوڵان دەگـری!
چریکـەی بولبـول و قاقـای کچـانی بێـری تێکـەڵ بـوون
فـەقـەت ڕۆحـی منـە بـۆ دووره بـەزمـی هـاوەڵان دەگـری
لە کوێستان کـارگ و ڕێواسـان بـە بـار هـاتن بـەرەو شـاری
چ خۆشە ئـەو دەمـەی دەستی کچۆڵـەی شـاخەوان دەگـری
لەسەر دوندی چیای قەندیلیسەربەرز دەسڕەکەت سووڕ دەی
دەبـینی جـا لـە خۆشـیانا تـەواوی کوردسـان دەگـری
بـەهـار هـات و تـەبیعـەت وەک نیگارسـتانی ئـەرژەنگـە
فـەقـەت شـیعری منـە بـۆ ئـەو وشـانەی ڕاو نـران دەگـری
لـە سـەر تۆیـە گوڵـی جـوانم بـەهـاریش ڕەنگـی ژاکـاوە
مـەکـە مـەنعـی ئـەگـەر «ئاسـۆ» لـە داخـی دوژمنـان دەگـری!

بۆکان- ١٣٨٥/٢/١٦

## گریانی دڵ

دڵــم بــۆ ئــەم وڵاتــە جوانــە ئــەگــری
مناڵـە و چاوکـە چـەن ژیرانـە ئـەگـری
لە بەر چەخماخەدانی هەوری حەسرەت
خـەیاڵـم هـەر وەکـوو بارانـە ئـەگـری
دڵــم گوڵــزاری ســەد ئــاواتی ســەوزە
بـەڵام بـۆ ئـەم گەلـە شـێتانە ئـەگـری
لـە بـەنـدی زولفـی خاوێـدا ئـەسـیرە
بە یـادی دەسـتی فریـای شـانە ئـەگـری
ئەگەرچی زۆر لەمێـژە عاشـقی گـوارەم
دڵـم ئـەمجـارە بـۆ لـەرزانـە ئـەگـری
شـنەی بـا کۆرپـەی ئـاواتم ئـەکـا ژیـر
کەچی ئـەو بۆ نـەبـوونی نانـە ئـەگـری
کەس و کارم لـە مـن دوور و کـەنـارن
دڵــم بــۆ دووری هــاوەڵانــە ئــەگــری
پــەنـام هــەروایــە یــەزدانــە لــە ژینــدا
چەمـم بۆ لـوتفی چـاوەڕوانـە ئـەگـری
لە کوێن ئەی هاوەڵانی هەستی شـیعرم؟
کە «ئاسۆ» هەر وەکـوو دێوانـە ئـەگـری

باغی میراوا ـ ٧٥/٤/١٠

## شەونم

ئۆخــەی نــەمــردم و لــەو شــەونمــەم مــژی
ئــەقڵــم گــوتی مــەکــە، ئــەشــقم وەسـا دژی
ئــەی ئــەقڵــی دژ بــە ئــەویــنم! بــڕۆ، بــڕۆ!
ئـەی ئـەشـقی عـومری چـل‌ونـۆ بـژی، بـژی!
فـەرقـی نییـە بـۆ گـرتنی داوێنـە یـا بـەهـێ!
قەیدی چییە هاڵا لـە دڵـت پـەلکـە یـا قـژی؟
جامت حـەرامـە وە دەسـت کـەوت ڕژانـدنی
شەرت مەستییە نەک پیاڵە بە خاڵی وە یا تژی
بەرماڵی نوێژی بێ چەمەن و کانی ئافـەریـن!
کێو نوێژگـەیـە، خاوێنـە گـڵ و گیـا و گـژی
زستانی پـیری وەدەر نـێ لـە دڵـا چـاوەکـەم!
چارشـێوی جوانییـە سـەرمـا و تـەم و مـژی
زۆر تـەنگـە قافیـەکـەت «ئاسـۆ»! هـەڵـێ
مەعنای هـەمـوو لـە نبـۆن بـەسیە نـایکوژی!

بۆکان_ ٨٥/٢/٣١

شــەماڵــی کــاتی نــەورۆزە و لای داوە پــەچــەی دووری
بــە ئــەم بایــە چــرای دڵ نــاکوژێتۆ خــۆش دەبــێ نــووری
لـە زانسـتگای چـەمـەن پـۆلی قوتـابی گـوڵ وەدەر کـەوتـن
هەمووی هـەر دڵڕفێنـە زەرد و سـەوز و چێـرەیـی و سـووری
بــە تــەنیــا مــن لــە نێــو پــۆلی ڕەفیقــانم بــەجــێ مــاوم
ژیــانم ڕادەبــووری وا بــە مــەزڵــوومی و بــە مــەجبــووری
دەڵــێی دەرزی هومێــدم تــوورەکـەی بـەخـتی مـنی هـەروا
لـە نوخشـانەی هـەوەڵ ڕۆژم بـە خاڵـی و بـێنـەخـش دووری
ئەرێ ئەی بەختی ڕەش تا کەی لەگـەڵ مـن هێنـدە ناسـازی؟
ئەرێ ئەی کوڵمی گەش تا کەی لەگەڵ من هێندە ناجووری؟
هــەتـا دەسـتی هومێـدم شـل دەبــێ هـەر چـاوەڕێم جـارێ
بــە بــاغی ســینەتــا بکشــێ بــە مــەســتییا بــە مــەســتووری
بــەڵام پێــت وا نــەبــێ گیانــە ورەم بــەرداوە، هــەر کــرژم
هەتاکوو خاکی بەر پێی کـوردم و فـەرهـەنـگ و کولتـووری
وەکــوو «ئاســۆ» لــە بــەرزیڕا بــەرەو ژێــردەســتی دەڕوانم
فریـوی غـەربی قـەت نـاخۆم نـە بـاکووری، نـە باشـووری

بۆکان- ۸۱/۱/۱

## پاییز

خشەی پێی تێگەیشتن دێ لە ڕەمزی جوانی پاییزی
دەڵێی بۆنی بەهەشتی پێیە شەوبای ژوانی پاییزی
لەبەر زەردی گەڵا ڕەنگی تەبیعەت مەعدەنی زێڕە
بە زێڕ نایێ ورینگەی بولبولی گریانی پاییزی
هەور هەروەک دوو چاوی ناهۆمێدی بێهەرا دەگرین
گەواڵن بوونەتە کوێنی ملی ئاسمانی پاییزی
تەپ و نم دایدەکا شەوگاری دوور و ساکتی لادێ
هەمووی ئاهەنگی بارانەن تکەی بارانی پاییزی
ئەگەرجارجار لە نێو پۆلی دڕوو دیار بێ گوڵێکی سوور
پەڕی شووخاڵی هەستاوە بە شووی زریانی پاییزی
گەرووی شمشاڵی پیرە شوانی کوردی پڕ لە ئاهەنگە
کەچی حەقنادیارە چەشنی ساڵان شوانی پاییزی
کە یەککەوتن بەتێکڕا تەیر و سێروو «ئێرە جێ بێڵن»
هەموویان بەدرەقەی ڕێیان، تکەی گریانی پاییزی
منیش تەیرێکی بێباڵم لە شەوگاری ڕەشی ژیندا
خەریکی شیوەنم تەنیا لە نێو بێستانی پاییزی
لە دەس ئەم پایزە دڵتەنگە «ئاسۆ» ڕوو بکە مەیخانە
مەگەر فریات کەوێ ناڵەی بەیان بەردانی پاییزی

ساروقامیش_ ٧٣/٧/١٠

نزیکە گەل نەجاتی بێ و گولۆڵەی بێتە سەر ڕاستی
مەڵێن قەت دەورە ناگۆڕێ ئەوەی وای‌کوت ملی ماسی
کە پەرچەم بوو بە دەسرەی دەستی سەرچۆپی ئەدی زانیم
بە بلوێر و بە بالۆرە گەلی کورد مافی خۆی ناسی
بەهار هات و تەبیعەت بوو بە کانگای ڕەنگ و ئاوازە
لە زستان و لە بەدبەختی نەماوە دەنگێ یان باسی
گوڵی سوورم! لەبەر تۆیە بەهارم چەشنی پاییزە
لەبەر چاوم درووی شینە گوڵی سەر پەلکی ڕێواسی
ئەتۆ حەقتە لە ئامێزی ڕەقیبا غونچەئاسایی
گوڵی لێوت بپشکوێ چون خەزاڵی دڵبەری لاسی
ئەمن مەزڵوومی لاوی خۆم بژاری مووی سەر و شێوەم
بە هیچ داسێکی نادروێ؛ مەگەر بە برۆی وەکوو داسی!
لەمێژە وەک پەپوولە باوەشی گوڵ جێی حەشارگامە
گوڵم زۆر دیوە ئەمما تۆ لە نێو پۆلی گوڵان خاسی
گەلم تا خێوی پەرچەم بێ و گوڵم ئازادی سەردەم بێ
دەبێ حاڵی چ بێ «ئاسۆ» بە خۆی و شیعر و ئیحساسی!

بۆکان_ ٨٦/٢/٨

چـاوی چـاوم! تـۆ گولاڵـەی جـوان و نـەخشـینی مـنی
تــۆ هومێــدی ژینمــی، هــۆی شــادی و شــینی مــنی
مـن ئـەگـەر مـەجنـون و بیـژەن، یـاخۆ فـەرهـادی گـەلم
هــەر ئـەتـۆ لـەیـلا و مـەنیـژە و خاسـە شـیرینی مـنی
زۆر لــەمێــژە مــن لــە میحــرابی برۆتــدا نــوێژ دەکــەم
تو لـەجێـی تـەحیـات و سـوجدە و بانـگ و ئـامینی مـنی
وا دەڵێن فەسڵی بەهارە و دەچنە سەحرا و چۆڵ و دەشت
لای ئــەمــن زســتانە؛ ئــەممــا تــۆی کــە هــاوینی مــنی
شار و کووچە و سەرشـەقام پڕپـڕ لـە چـاوجوانن؛ بـەڵام
هــەر ئـەتـۆی تــەنیـا شناسـی چـاوی جـوانبـینی مـنی
تـۆ غــەریـبی لێـرەکانـە وەک ئـەمـن، بـۆ پێکـەنـین
ئانکـەڕا و سـیدنی بـە مـن چـی؟ تـۆ پـەری چـینی مـنی
مــــن لــــەمێــــژە وام بــــەڵــــێن داوە دژی بێــــدادی بم
زوڵــمی زاڵــم هیچـە لام تـا هـۆی ورەی ژیـنی مـنی
تێـر لـە گوفتـارت نـەبـوو «ئاسـۆ» لـە ترسـی ناکـەسـان
سـیمەکـەش نامـەحـرەمـە، تـۆ مـەحـرەمـی دیـنی مـنی

بۆکان ـ ٧٨/١/١٦

## دەڕۆی

دیم دڵـی مـەجنـوون بـە تاڵـێ مـوو بـە دووی لـەیـلا دەڕۆی
پێم کوت: ئەی شای خۆشەویستی بۆ بە یەک هەودا دەڕۆی؟
پێکـەنی و فـەرمـووی کـە ئێـرە شـاری عیشـقە بـێخـەبـەر
کەڵ بە موو بەندە، ئەگەر تـۆش بی لـە جێـی مـن وا دەڕۆی!
تـۆش هـەتـاوێ بـووی لـە نێـو شـاری دڵـم خـۆت دا نیشـان
چەشـنی مـانگی یـەکشـەوەش گورجێ دەبـێ ئـاوا دەڕۆی
مـن بـەتـەنیـا جـێ دەهێڵـی و ئـاهی سـاردی نیـوەشـەو
چۆن بە پێـی خـۆت هـاتی بـۆ لام، ئێستە واش تـەنیا دەڕۆی
گـەرچـی نیسـانێکی بـێ بـەرگ و گوڵـە و دنیـا تـەمـە
وەرزی بارشتی خـەمـە و تـۆش خـەم دەچێنی و جا دەڕۆی
مـن چنـارێکم گـەڵام زەردە؛ بـەڵام ڕیشـەم پتـەو
کـۆترە باریکـەی هـەواڵـی و تـۆ لـە بـۆ هـەر لا دەڕۆی
چـەن بـەیـانی هاتیـت و هێلانـەت لـە سـەر شـانم نـەکـرد
دەک نمـەکگـیری ئـەویـن بی وا بـەبـێ پـەروا دەڕۆی
وەک مەلی شەو سـەردەمـێ خوێنـدت لـە بـۆ هـەستم بـەڵام
دات لە شەققەی باڵ و بێهـەسـت جـێم دەهێڵـی و وا دەڕۆی
چـەشـنی «ئـاگر» خۆڵـی بـن کۆنـەهـەوارت هـەڵـگڕاند
«ئاو» لە بـیری هـەستی «ئاسـۆ» هـات و وا وەک «بـا» دەڕۆی

بۆکان- سێزدە بەدەری ٧٣

## ترووسکەی هیوا

نەمکوت ئەم وەرزی خەمە تـوولی هـەتـا سـەر نابـێ؟
نـەمکـوت ئـەم دەردی ئـەویـنـەت لـە دڵا هـەر نابـێ؟
دەردی هیجرانـە لـە مـەڵـبـەنـدی ئـەویـنـداری ئـەگـەر
هـیـچ مـەترسـێ کـە ژیـان دەردی سـەراسـەر نابـێ
"شەرقی ئەوسەت" ئەگە هەر مەرکەزی زوڵم و ستەمە
ڕۆژهـەڵات جێگـە هـەڵاتی گـەلی لاو هـەر نابـێ
دیـارە هـەر چۆمـێ مـراوی نـە لـە بـاوەش دەگـرێ
دیـارە هـەر ئێسـکێ لـە دەریایـە بـە گـەوهـەر نابـێ
بۆ گڕی سینە فەقەت سۆزی ئـەویـن بـێ بـەسـە بـەس
مـافی ئینسـانە ئـەویـن باسـی بـە خـەنجـەر نابـێ
ئـەو کـەسـەی سێبەری بـن بـەژنی چنـارێکی هـەیـە
دڵـنیام ژیـنی شـەهـانی لـە بـەرابـەر نابـێ
پێکـەنـینی گوڵـەبـاخم گـەلـێ جـار دیـوە بـەهـار
کەچـی وەک زەردەخـەنـەی سـەردەمـی دڵـبەر نابـێ
سەر لە «ئاسـۆ»وە وەدەر دێنـێ بـزەی تیشـکی هـەتـاو
شـیعری دڵـداری ئـەدی بـێ کـەس و بـێدەر نابـێ

بۆکان- گوڵانی ٧٦

## پێکەنینی گوڵەباخ

نـەمکـوت ئـەم دەردی ئـەوینـەت لـە دڵا هـەر نابـێ؟
نەمکوت ئەم وەرزی خەمەت تووڵی هەتا سـەر نابـێ؟
«شەرقی ئەوسەت» ئەگە هەر مەرکەزی زوڵم و ستەمە
ڕۆژهـەڵات جێگـە هـەڵاتی گـەلی لاو هـەر نابـێ؟
دەردی هیجرانـە لـە مـەڵـبەنـدی ئـەویـن بۆتـە پـەتـا
هـیچ مـەترسـێ کـە ژیـان دەردی سـەراسـەر نابـێ
دیـارە هـەر چـۆمی مـراوی لـە پـەنـای جـێ نـادا
دیـارە هـەر ئێسـکێ لـە دەریایـە بـە گـەوهـەر نابـێ
بۆ کڵی سینە فەقەت سۆزی ئـەویـن بـێ بـەسـە بـەس
مـافی ئینسـانە ئـەویـن، کـاری بـە خـەنجـەر نابـێ
پێکـەنـینی گوڵـەبـاخم گـەلـێ جـار دیـوە بـەهـار
کەچی وەک زەردەخـەنـەی سـەر دەمـی دڵـبەر نابـێ
ئـەو کـەسـەی سێبەری بـن بـەژنی چنـارێکی هـەبـێ
دڵـــنیام ژیـــنی شـــەهـــانی لـــەبـــەرانبـــەر نابـــێ
سـەر لـە «ئاسـۆ» وەدەر دێنـێ بـزەی تیشـکی هـەتـاو
شـیعری دڵـداری ئـەدی بـێ کـەس و بـێدەر نابـێ

بۆکان_ ٧٦/٤/٦

که سـەرم گێـژی خـەیاڵـی غـەزەلێکـی سـڵ ئـەبـێ
قەڵەمی هەستی ئەویـن بـۆ وشـە کـوا مـاتڵ ئـەبـێ؟
سەری سەد تاج و تەقەددوس بە سەران دێنـە زەوی
کامە شێت و بـەدەوی بـێ بـە ئـەویـن عـاقڵ ئـەبـێ
کوا دڵم تەنگـە بـە فـێڵ و فـەرەجـی قـەومـی درۆ؟
هـەرچـی سـیحرێکی هـەیانـە بـە نمـێ بـاتڵ ئـەبـێ
داری هـەسـتم بـە قـەرا باڵـی حـەقیقـەت سـەوزە
بەسە بێمەیلـی بـرا، کـێ دڵـی وا پـڕ کـوڵ ئـەبـێ؟
تا لە سەر پەلکی گوڵی ڕوو نەمژێ شەونمی عەشق
چۆن پەپوولەی دڵی کەس وێڵی تەوافی گوڵ ئەبێ
ئەی تروسکەی سەحەری شەونمی هیوای دڵەکەم!
نـاوەرۆکـی غـەزەلم هـەر بـە ئـەتـۆ کـامڵ ئـەبـێ
بـاوەشـت کۆشـکی مـورادی حـەز و ئـاواتی منـە
هەستی خاوێنی خەیاڵت نەبێ ژیـن موشـکڵ ئـەبـێ
بە تەزووی هەستی ئەوینت دەم و دەست دێنە وتـار
ئەو دەمەی سارده دڵم، گەر لە غەمت غـافڵ ئـەبـێ
گـڕی ڕیسـوایی منـە سـووری دەگێـڕێ «ئاسـۆ»
تا نەسووتێم بە ئەوین کوانێ ئـەوێم مـەنـزڵ ئـەبـێ؟

بۆکان_ ٧٦/٨/٢٨

## خوێندەواری عاشقانە

قەترەیێ فرمێسکی چاو، قوولّـی بـە قـەت دەریـا دەبـێ
تـا بــەرەو ئاســۆ بــڕۆی ئاســۆیێ دی پــەیــدا دەبــێ
مــن دەزانم ئــەم ئــەوینــەی بۆتــە ئــاوی زینــدەگــیم
عاقبــەت هــەر شۆڕشــێکی پــاکی لــێ پــەیـدا دەبــێ
تۆ هەتا بووکی خەیاڵـی خۆشـەویستیت خـۆش نـەوێ
جـوابی نامـەی عاشـقانەی گـەلپـەرەستیت «نـا» دەبـێ
من گڕی شەمعی جەماڵی هەرچی گوڵ بوو خوێندمەوە
خوێنـدەواری چـاوەکـەم بـۆ وەرزی شـەو ئـاوا دەبـێ
ئەو دەڵـێ هـەر مـن دەزانم ڕەمـزی تـازەی زینـدەگـی
بەم قسەی قەرزی قەڵەم جا چۆن لە ئەستۆی پـا دەبـێ؟
سـەد خـراپیش بـێ لـەگـەڵ ئیحساسـی پـاکی عاشـقی
وەحشەتی ناوێ کەمـێ گـەر گـەورەتـر بـێ چـا دەبـێ
هەر کەسێ گەر قیبلەکەی بەر حەزرەتی گوڵ بێ بەهار
هــەرچـی نـوێژی بـێ قوبوڵـی بـارەگـای ئـەولا دەبـێ
بۆیــە «ئاســۆ» ســەر شــەتــاو و چــۆمی لا ئــاواترە
لــەم گوڵســتانە دەڵــێن زۆرتــر دڕوو پــەیــدا دەبــێ

بۆکان- بەهاری ٨٠

## بە یادی ئەدەب

نوسرەتێ تاکوو نەبێ بۆچی ئەدەب شەیدا دەبێ؟
کوانێ میسباحی بەرافی حاکمان و شا دەبێ؟
نووری ئەشقە گەر دڵی شەوگاری ڕەش خۆی دەربخا
ڕۆژی ڕووناکە و نەخۆشی دڵڕەشی پێ چا دەبێ
تا لە باغی خۆشەویستی ساز نەکا جۆلانەیێ
کوانێ کاتی مردنیشی باغچە بۆی مەئوا دەبێ؟
ئەو شەوی ڕەش بوو بە بەرقی مەجلیسی پاشا و گەدا
ڕۆشنی و شیعر و ئەدەب لێکدان، برا، ئاوا دەبێ!!
تۆ لەگەڵ یارت دەبێ گیانێکی نێو دوو جەستە بی
جا ئەوێ دەم فاسیلە و مەودا هەمووی یەک لا دەبێ
گەر خەتی خوارت لە بن سەردا نەبێ ژێر ناکەوی
هەر بە پاکیشە حیساباتی لەوەو پێش پا دەبێ
شاعیری و کوردایەتی لەم عەسرەدا وەک نان و دۆن
گەر بە ڕاستت بێ ئەوەی بۆ حەول ئەدەی پەیدا دەبێ
هەر بە حەول و پاکییە ئەو چۆڵنشینەی «مامی» کورد
کێو بەجێ دێڵێ و مەقامی حاکمی «بەغدا» دەبێ
باسی چاو و ڕاو مەکە «ئاسۆ» حەسوودی هێند هەیە
«کێو» لە سەر دەس دابنێی لای دوژمنانت «کا» دەبێ

بۆکان_ ٨٦/٣/٢
ساڵڕۆژی فەوتی میسباحوددیوان

**دەسنویێژی شیعر**

ئـەو دەمـەی چـاوم بـە چاوشـینی دەریـات ڕوون دەبـێ
تێدەگـەم چـۆن فـەردی عـامی بـۆ سـیحر ئـەفسـوون دەبـێ
سـەدهـەزار هێـزی بکێشـی هـەن لـە یـەک قرتانـدنا
کەی شەپۆل وەک هەستی ئاشق بۆ قەراخ مەمنـوون دەبـێ؟
عیشـقی شـیرینە کـە فـەرهـاد بـەرد دەنووسـێ وەک کتێـب
چـاوی لـەیلـە گـەر بقرتـێ سـەد قـەیـس مـەجنـوون دەبـێ
بـۆنی عیشـقە و فاسـیلەی لا وەسڵـەتـە و چـاو چـا دەکـا
تـا زولـەیخایـێ نـەبـێ یۆسـف چلـۆن مـەزنـوون دەبـێ؟
خاڵـی یـارە چـەشـنی نوختـە حـەرفی پـێ مـەعلـووم دەبێ
ماڵی یـارە گـەر دەرت کـەن هێسـتە هـەر بـۆ چـوون دەبـێ
سەر کەرێزی فیکـری تـۆ وەک بـەحـری نـۆرویژە و سـوید
گەر کەرێز و چۆم نەبێ شەت ڕووبەڕووی کەمبـوون دەبـێ
مـافی خۆمـە بـۆ شـفا چـاو کـەم لـە سـینای سـینەکـەت
وەک هەژار هەر کەس ئـەقـڵ بـێ هـەر دژی قـانوون دەبێ
خـۆم بـە قوربـانی وتـەت بم بـۆچی نامـدوێنی چـەلـێ؟
تـەبعـی «ئاسـۆ» بـەو بـزەی لێوانـەتـە مـەوزوون دەبـێ

سەقز ـ بۆکان

لە پاش مردن بە من چی هەر چی پارکە پەیکەرەی من بێ!
بە من چی قەبرەکەم ژوانگەی گەلی لاو و کچ و ژن بێ!
ئەگەر ساقی ئەوێستا مەی لە دەفری من دریغی کا
دەپارێمۆ لە ئاهوورا: ڕەبی شووشەی دەسی کون بێ
قوتابی مەکتەبێکم من کە دەرزی پەرچەم و خاڵە
پەشیمان نیم ئەگەر جەستەم تەواوی دەرزیئاژن بێ
دەروون وەک جامی بێگەردە، مەهێڵە خڵتە پیسی کا
بە سابوونی ئەوین بیشۆوە دڵ، زۆر حەیفە چڵکن بێ
ئەمن خنکاوی نێو دەریای دوو چاوی شین و بێدەنگم
ئەتۆ پێت وایە قەت ناوم لە کۆڕی عاشقان ون بێ؟
بە چاوی تیژی دڵداری کە چاوم لێدەکەن جوانان
ئەدی قرچۆک دەبین شووڵی قەفەز گەر پاکی ئاسن بێ
لە گێژاوی ژیانتدا ئەوین بێتە پەڕ و باڵت
وەکوو سۆنەی نەبێ ترست، ژیان گەر بەحری بێبن بێ
هەتا «ئاسۆ»ی! هومێدی من بە ئیشارەی ئەتۆ ڕوونە
وەجاخی شیعرەکانیشم دەبێ هەر پاک و ڕۆشن بێ

تەورێز ـ ٨١/٦/٢٠

## پەیمان

شـەرت و پـەیمـان وا بـەڕێـزە گـەر شـکانی تیا نـەبـێ
پیــاوەتی کاتــێ بــەهێــزە قــەت وچــانی تیــا نــەبــێ
ســاقی گــەر پیاڵــەی پــڕی پێـدای لـە دەسـتی وەرگـرە
مــەســتی وا خۆشــە ژومــارەی ئیســتیکانی تیــا نــەبــێ
هەر کەسێ هات و بەکەس خۆی پێ نیشاندای کـەس نییـە
خۆشـە مێـژووش سـەرگورشـتەی ناکـەسـانی تیا نـەبـێ
ئــاوی عیشــقە خــاک و خۆڵــی بێکــەســی دەشــواتەوە
ســفرە بــا هــەر تیکــە نــانی هــەنــدەرانی تیــا نــەبــێ
چــاوی تــۆ چــاری نــەخۆشــینی دڵــی چۆڵــم دەکــا
چـۆڵ دەبـێ شـوێنێ ئـەگـەر چـەن چاوەکـانی تیا نـەبـێ
گــۆی زەوی وەک تــۆپی فوتباڵــە، خــڕە و بــاری نییــە
پووشـە لای مـن گـەر خـەریتـەی کوردسـتانی‌تیا نـەبـێ
تۆ و ڕەقیب و ئەمن و شیعریش، هەر کەسێ خۆی و گوڵی
لێـی‌گـەڕێ تـەقسـیمی گـەردوون بـا تـەبـانی تیا نـەبـێ
ڕۆژی ئـەووەڵ سـەهمـی مـن بـە زیـاد کـراوە چاوەکـەم
کامــە دڵ هــەن جێــی بــرینی دوژمنــانی تیــا نــەبــێ؟
ژیــن وەهایــە شــادی و گریــان بــە یــەک بــەســراونەوە
نــەمــدی گریانــێ ســبەی قاقــا کێشــانی تیــا نــەبــێ
سـەد قـەڵای کـۆن تـازە بـوو، سـەد تـازە کـاخیش داڕمـان
چیتـە «ئاسـۆ»؟ تـۆ دەڵـێی ژیـن داڕمـانی تیـا نـەبـێ؟

تازەقەڵا_ ٨٥/١٢/٢

## زەنگی جودایی

کەس نەبوو گەر حەنجەرەی عەشقی بە دووری گڕ نەبێ
کەس نەبوو پەنجەی گوشینی زەردەبەی لێ سڕ نەبێ
وردەوردە کۆن دەبێ چیرۆکی عەشقی ئەمن و تۆش
حەیفە ئەو تین و ئەوینە هەر بە سۆز و گڕ نەبێ
لەم هەوارە هەر دەواری عەشقە وا قەت ناپوێ
بێجگە لەو نەمدی دەوارێ گەر بە بای ژین شڕ نەبێ
نایەتە سەر لێوی کەس بادەی خەیاڵی مانەوە
تا وەکوو پیاڵەی دڵی بۆ خۆشەویستی پڕ نەبێ
کەی لە جۆگەی شادمانیت پووشی غەم دەخرێتە لا
گەر شەتاوی پڕ خرۆشی جوانپەرەستیت خوڕ نەبێ؟
ڕەوڕەوی ژین وەک کچی جوان وایە، لا ناکاتەوە
تامی نامێنێ ئەگەر جارجارە گورگئاوڕ نەبێ
تۆ ئەگەر غەمباری جەوری گورگی خوێنڕێژی مەڕی
دوور بە لێی! نەیدیوە کەس خێڵی گورگ زگدڕ نەبێ
هەر کەسێ لافی برایی و گەلپەرەستی لێ ئەدات
جوانی تێ بڕوانە «ئاسۆ» ئاگەدار بە زڕ نەبێ

مهاباد/ بۆکان ـ ٧٤/٣/٢

## شەمی هیوا

شەو شەمی هیوا نەبێ ڕێگا لە ڕێبوار ون دەبێ
هێندە سەخت و ڕژدە ڕێگا کاڵەی ئاسن کون دەبێ
سووتنی پەروانە بۆ تۆزقاڵێ شەوقی نێو گڕە
من گڕی شەوقم لە دڵدا، عاشقی وەک من دەبێ!
با «هەژاریش» بم، ئەوینێکی «حەقیقی»م گەر هەبێ
«هێدی هێدی» دەردی سەختی بێکەسیم «هێمن» دەبێ
چون هەواری خۆشەویستی تۆی خەزاڵم هەڵبژارد
تازە کەی باکم لە ژاری تیری چاو چڵکن دەبێ؟
گەر بزەی پەریانەکەی غەملابەری لێوت نەبێ
کوا لە گۆشەی شاعیرانەی ژین دڵم ساکن دەبێ؟
شەرمی پێ ناوێ ئەگەر چاوێکی ڕەشڕەش دڵ بەرێت
دڵ نیشانەی تیری ئەبرۆی چاوڕەشی شەرمن دەبێ
من لە سەر باڵی فریشتەی سەوزەپۆشا جێم هەیە
کوانێ ئەو ترسەم هەیە؟ هەستم جەغارئاژن دەبێ[1]
هەرکەسێ هات و کوتی: «ئاسۆ»! ئەوین سووکت دەکـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــا
تۆ بڵێ: تا سووک نەبێ مەل کوا لە هەوران ون دەبێ؟

بۆکان_ ٧٤/٣/١٣

---

١- پڕ لە جەغار: خەم

## پێی بڵێ ...

پێـی بڵــێ خاڵــو مــەلا هیــوای بــە نــوێژی شــەو نــەبــێ
ڕۆژ لـە فێڵـێ بـێ لـەم و لـەو، شـەو بـە هیـوای خـەو نـەبـێ
تــا بـــرۆی تـــۆ بـــێ گوڵـــم میحـــرابی مزگـــەوتی دڵـــم
حـەسـتەمــە نـوێژێکی مــن حـەفتـا ڕکـاتی ئـەو نـەبـێ
وا بــە فیــز پێــت دامــەنــێ کاکــە لــە ئـاوزەنگـی خـەیـاڵ
شـایەد ئـەو ڕێـی پێـت سـیڕاتی موسـتەقیمـە هـەو نـەبـێ
وا بـەهـارە و بولبـولی سـەرمـەسـتی گـوڵ هـاوار ئـەکـا:
شـێتییە ئێسـتا لـە کوێسـتان گوێـت لـە قاقـای کـەو نـەبـێ!
چاوکە چۆن وەستای سوروشت ڕەنگاندی سەحرا چەشنی بووک
مەنـزەرەی وات پـێ نیشـان دەم قـەت لـە نێـو مەسکەو[1] نـەبـێ
چونکـە سـەرسـەوزی چـەم و ڕۆبـاری کـوردی بـووم ئـەمـن
هـیچ چـەمـێ گێـژی نـەدام غـەمـزەی چـەمـی پـڕ خـەو نـەبـێ
ترسـی خنکانـت نـەبـێ گـەر چوویـە نێـو بـەحـری ئـەویـن
چـۆن دەبـێ ئاومالّـکە تووشـی خوڕگـەن و گێـژەو نـەبـێ؟
حـاجی مـاچی بـەردەکـەی خـۆی پـێ حـەجـە و مـن خالّـی تـۆ
جـا چ بـوو، قـەیـدی نییـە چـەشـنی حـەجـی مـن لـەو نـەبـێ!
(تـا لـە «ئاسـۆ»ی نـووری تـۆدا دیومـە شـەوقـی عاشـقی)
ترسـی تـاریکیم نییـە حـەتتـا کـە یـەک پـەرتـەو نـەبـێ
بەندی کۆسەی بۆکان– ١٣٧٢

---

١ – مۆسکۆ: پێتەختی وڵاتی ڕووسیا.

## پارکی نامۆ

دەمـەو ئێوارێـیـە و تیشـکی هـەتـاویش دەیهـەوێ لاچـێ
لـە ئاسـۆ خـۆ وەشـارێ و پرچـەکـەی زێـڕینی هـەڵـپاچێ
لـە نێـو پـارکێکی نـامۆ چـاو دەگێـڕم بـۆ بـزەی لێـوێ
بزەی چی؟ لێـو دەبـێ تـازە بـە بـادەی کـۆنی غـەمدا چـێ
بـەدی ناکـەم لـە سـەر لێـوی کـەسـێ سـرتەی سـڵاوێکی
سـڵاو ئـەمـڕۆ دەڵـێی پووڵـی زەمـانی پێشـووە و ناچـێ
هەزاران سوورەگوڵ شەونم لە سەر لێویان تroوسکەی دێ
پەپوولەی عاشقیش تینـوو و غـەریبـە و هـەڵـوەدای ماچـێ
ئەوا پـڕ کۆشـی سـەوزی ئاسمـان ئـەستێرە کـۆن؛ ئـەمما
بـزەی هیچیـان لـەوانـەی ئاسمـانی شـاری مـن ناچـێ
هومێـد ئـەوڕۆ غـەریبـە، ناهومێـدی هـەروەکـوو خـۆرە
خـەریکـە بـەرگـی سـەوزی شـیعرەکـانم پـاکی داپاچـێ
ئـەوەی شـادی لـە نێـو ئـەم خـەڵـکە بـرد و شـیوەنی هێنـا
بە نووکی خەنجەری تۆڵەی حـەقئـەستێنی خـودادا چـێ
لـە داخ ئـەم ویشـکە بـێدینانـە «ئاسـۆ»! ڕوو کـە مـەیخانـە
جبـە و تـەسـبێحەکـەت دانـێ لـە ڕەهـنی ملبـەن و خاچـێ

تاران ـ قەڵای حەسەنخان ـ ٧٢/١١/١٥

## دەنگی زەنگی ئاشنا

بۆ کۆنگرەی پاوە

وا لە دوور دیسان زرینگەی زەنگی سەر کاروانە دێ
بۆنی شیری شیعری پاکی خاکی هەورامانە دێ
هەورە ئێستا دێتە ئامان تا بریسکەی باسەکەم
دێتە چاوی ئارەزووم و دایەنی بارانە دێ
ئەو چڵوچێو و پلەی گەردوون کە پێی نەدرابوو تل
خاک و خۆڵی پاییزی چەشنی کلی چاوانە دێ
وا بە بلوێری گەرووی مێژوو هەوای «مەجنوون» دەڵێن
«بالادەستانی» بە ڕۆحی پاکی «ئەکبەر»خانە دێ
سازە دێ، ئاوازە دێ، دەنگی قەناری و بازە دێ
سۆزە دەم، هەمڕازە دێ، ئاهەنگی سەربەرزانە دێ
شیعری عەبدولقادرە «پاوە»ی بە پاوە ڕادەگرت
زایەڵەی سۆز و هەناسەی بیری «بێسارانە» دێ
شاخی هەورامان، بە باڵی شیعری ئەو شاباڵی گرت
وا تەزووی بەرزی و بەڕێزی «شەو» لە گوێی بۆکانە دێ
دووکەڵی ئاهی ئەوانە بۆ ولاتی بەشخوراو
ئەو هەناسە و ئاگرەی ئێستەش لە «کرماشانە» دێ
خاکی «موکری» تا گەزۆی «هەورامی» شیرینی نەکا
کوا لە زاری شاعیرانی شیعری «فەرهادانە» دێ؟
بێستوونی دەردی ئەم کوێستانچییانەی کێوبڕە
کونکونی تیشەی ئەوینە دەردەچێ و دەرمانە دێ

**<u>دەسنوێژی شیعر</u>**

گـەرچـی پـاییزە لـە پـاوە ڕەنگـی کێـوان زەرد نییـە
دەنگی بولبول وا لە سـەر هـەر سـەرچڵـی قـەزوانـە دێ
گــەر دەپرســی بــۆچی دەنگــی وا زوڵاڵ و دڵگــرە
گوێی دڵم هەستی دەکا هەستێ لە ژوور هـەورانـە دێ
زەردی پـاییزی وڵاتم سـەوزئـەبـێ عـەیـنی بـەهـار
وەک کراســی تــازە ڕەنگــی لــەم وڵاتــە جوانــە دێ
تۆ پەژارەی چیتـە «ئاسـۆ»؟ گـوێ گـرە «هێـدی» دەڵـێ:
«من بـە خورپـەی دڵ دەزانم هـەستی پێـی جانانـە دێ»

بۆکان- ٧٤/٦/٢١

من دەڵێم مەگری کە بسکەی زەردە لەو دوو لێوە دێ
ئەو دەڵێ کوا زەردی پاییز پێکەنینی پێوە دێ؟
لێم دەبێتە حۆرییێکی نێو بەهەشتی وادەیی
هەرکەسێ گەر بۆنی خۆشی عەترەکەی تۆی لێوە دێ
سۆفی پێی وایە بە ڕەش نووری ئەوین تاریک ئەبێ
ئەی ترووسکەی جوانی تۆ بۆچی لە بن چارشێوە دێ؟
گەر دەڵێی تاوانی من بوو ئاشکرا بوو ڕازەکە
ئەی پەیاپەی ئەم پەیامانە لە خزمەت کێوە دێ؟
هێندە سەبرم کرد هەتا پەردەی سەبووریم لا درا
خۆت دەزانی چاوەکەم من کەنگێ سەبرم پێوە دێ
تۆ بەڵێنی وەعدەیێ دیداری دیکەم پێ بدە
جا دەزانی باسی جوانیت چۆن لە شار و دێوە دێ
ئەو بەهارەی تۆ بەجێت هێشتم خەزان بوو بۆ دڵم
ئێستە بەم هاوینە بۆچی دەنگی تۆ لەم نێوە دێ؟
پاییزم هەر لا بەهارە، وەرزی عاشق هەر یەکە
تا لە باغی سینەکەی تۆ بۆنی یاس و سێوە دێ
شەرتە تا «ئاسۆ» بژی هەر وا بە یادی تۆ بژی
سوور بزانێ ئەم خەیاڵە بۆنی خوێنی لێوە دێ

تەورێز ـ هاوینی ٧٩

## دەنگی پێی ئەسپی تەمەن

وردەوردە دەمـــی کۆچبـــاری هـــەوای لاوییـــە دێ
دەنگی پێی ئەسپی تـەمـەن لـەم کـەژە بـەرداوییـە دێ
پـەڕی پـەڕپـەڕ بـووە لـەم گێـژەوە شـابازی خـەیـاڵ
سـیرڕەیـی باڵـی دەڵـێی شـیوەنی بـێڕاوییـە دێ
ناونیشـانی نییـە ئـەو گـۆڕە کـە کوشـتەی عیشـقە
ناڵـەناڵـێ کـە هـەبێ هـی خـەمـی بـەرچاوییـە دێ
داخەکەم ڕەمزی ئەویـن کـەوتـووەتـە دەستی نـەیـار
زەوق و شادی و مەی و نەی ئێستە فەقەت ناوییە دێ
چۆن دەڵێی لاچۆ خەفەت، دەرکەوێ با بووکی بزەم؟
دەورە دەورەی سـتەمـە وەختـێ کـەوا باوییـە دێ
گەر قەڵەم مـەستە لـە دەسما لـە بـەر ئـەو بۆنـەیـە وا
پەنجەکەم گرتی تورەنجێ کـەچـی هـەر ماوییـە دێ
وەرە دەنگ هەڵبڕە ئـەی بولبـولی گوڵـزاری ئـەویـن!
تـەلی تـاری نـەشـەکـەم دەنگـی لـە سـەر خاوییـە دێ
هــەوری بارشــتی دڵــم! وادەیـە، دایـرێژە بــەخـوڕ
ئاسمـانی بـۆنی سـەبـوونی لـە بـەر ئـەم ساوییە دێ
خـەمـی «ئاسـۆ» نـە خـەمـی بـێدەسـەڵاتی و کزییـە
چـەمـی کوێسـتانی سـەرم هـاژەیـی بـەفراوییـە دێ

بۆکان- ۷۵/۳/۲۰

ئەگەر ئاوێنە ئیشتیای لێ بێ عەکسی هەڵگرێ جارێ
بە غەیری ڕوومەتی جوانت چ نەخشێ دی وەناشارێ
بە خەندەی لێوی تۆ داری غەزەل بۆم دێتە بەرهێنان
نیگات سەوزی دەکا هەستم، نە من، هەر وشکەڵ و دارێ
دەزانم ویشکەساڵ ئیدی نەماوە دەورەکەی؛ چونکا
لە هەوری شیعری من غەیرەز تەڕی چی دیکە نابارێ
ئەوەی پێی وایە زانایە، دەبێتە مەدرەسەی جوانیت!
هەزار فەرزانە بێ مەڕدوودە ئاخری دێتە هاوارێ
ئەڕووشێنێ خەیاڵیش کولمەکەت گیانە لە بەر خۆتە
ئەگەر مەیلم لە سەیری باغی ڕوخسارت نییە جارێ
گڕی دیدارەکەت بەردایە جەرگی سارد و ناکامم
دەبرژێ جەرگ و دڵ بێت و بە لوتفی خۆت نەکەی کارێ
ئەگەر پێت خۆشە وشکاوی نەبێ کانی ئەوینی من
بەسە بۆم یەک بزەت بێتێ بە ڕووما کاتی ئێوارێ
فیدای خاڵ و خەتی تۆ بێ خەیاڵ و بێکەسیی «ئاسۆ»
لە من زیاتر کەسی دی نایەتە نێو زاری شامارێ

بۆکان- زستانی ٨٠

## نان و هەژاری

گوڵی بۆنخۆشی تەمەن پەڕپەڕە لێی هەڵدەوەرێ
گڵی دڵ تازە تەڕی شەونمی دەڕواتە سەرێ
لە کوڵی ئاگری عیشقا دەگرێ گۆزەیی دڵ
خۆزگە بەو شەخسە کەوا لەم کڵە ساغ هاتە دەرێ
ڕژد و دژوارە برا ڕێگەیی سەر دوندی هونەر
کێ هونەرمەندە ئەگەر هێندێ پتر بچتە سەرێ
غەمی ئەم نان و هەژاری گەلە چارەی نە منم
نان لە چنگاڵی بەور دایە بە خوێن دێتە دەرێ
من پەنای تۆم هەبێ ترسم نییە گێژاوی بەلا
لە پڕا بێت و لەگەڵ خۆی گوڵی ئەم ژینە بەرێ
پەنجەرەی ڕوو بە هەتاون نەزەری چاوی گەشت
سڕی ئەم بەستەڵەکەم، ڕەمزی هومێدم! نەزەرێ!
هەوری جەورێکی لەمێژینەیە داپۆشی هەتاو
وادەیە شێتە شەماڵم وەرە تاو بێتە دەرێ
دەرفەتە ساقی ژیان! دەفرەکە با خاڵی نەبێ
ڕۆژێ دێ جوانی دەبێ و نابێ لە «ئاسۆ» ئەسەرێ

بۆکان- ٧٤/١١/٢٥

## ئەگەر غەم لێمگەڕێ

باغـەڵـم پـڕ شـیعری پـاراوە ئـەگـەڕ غـەم لـێم گـەڕێ
شۆرەت و ناوم بە پووشـێ نـاوێ گـەر زەم لـێم گـەڕێ
بـاڵ لـە سـەر ئـەسـتێرە دەسـوێ شـاهەڵـۆی ئاواتـەکـەم
گەر لەمـەولا باسـی ڕەنـج و شـین و ماتـەم لـێم گـەڕێ
کەی وەکوو منداڵ بە بووکی چـینی شـیعرم ژێـر دەبم
گەر خەیاڵی باغی بەروێ و شەودزی مەم لـێم گـەڕێ؟
گوێ زەوی وەک تۆپی کایەی هەستی شیعریمە ئەگەر
لـەم وڵاتـە جوانـەدا کـەمبـوودی پـەرچـەم لـێم گـەڕێ
بـۆ ئـەوەی تـەیـری ئـەویـن هێلانـە لای شـیعرم بکـا
گێژەڵووکەی باڵشکێن! هەر تاقە یەک ژەم لـێم گـەڕێ
مـن چریکـەم ئاشـنای گـوێی دڵپـەژارانی گـەلـە
بـۆ نـەیـارانم، هـەیـاران! هـۆرە ناکـەم لـێم گـەرێ
با وەکوو پـەروانـە جێژوانم لـە سـەر گـوڵ بـێ منـیش
ئەی خەیاڵی هیجرەت و باسی وەلی و شەم! لێم گـەڕێ
تاکوو «ئاسۆ»م ڕوون دەبێ شەو چاو لە ئەستێران دەکەم
نامەوێ گوڵزاری تینوو و جـامی کـەمکـەم لـێم گـەڕێ

بۆکان ـ ٧٥/٤/١٢

که ترپەی لاقی باران دێت و دەرکەی پەنجەرەم دەگرێ
خەمی شیعرێکی دووریش دێت و وتاری حەنجەرەم دەگرێ
شنەی باڵی مەلی یادت کە هێلانەی بەجێ دێڵێ
دەبێتە گوڵوشەی شیعر و پەڕەی ئەم دەفتەرەم دەگرێ
بە هیوای هەڵفڕین تەیری ئەوینم دێ کە باڵ بگرێ
سوپای فرمێسکی جێهێشتن جەناحی مەیسەرەم دەگرێ
نە هاواری، نە گریانی، نە ئاهەنگی، نە حەیرانی
نە شیعرێ وەک چەلان دەستی خەیاڵی شەوچەرەم دەگرێ
بە تەنیایی لە نێو ژوورێکی بێئاوازی دڵداری
خوڕەی لووساوکی ژێر باران نیگای بەر پەنجەرەم دەگرێ
هەموو گیانم دەبێتە هەستی یادت لەو سەری دونیا
خەمی شینایی چاوت سەوزی هەستی نۆبەرەم دەگرێ
ئەگەر پەرژین و شوورەی کۆنە یاسا، لێم گەڕێ هەر دێم
بەڵام بێدەستەڵاتی دێ و ڕچەی ئەو لەمپەرەم دەگرێ
بە سەربازی غەزەل پێشی سوپای دووریتی گرت «ئاسۆ»
مقەستی تیژی سانسۆرە بەری ئەم لەشکەرەم دەگرێ

بۆکان_ ۸۵/۱۲/۱۱

## کۆڕی یاران

### بۆ جوانەمەرگ دوکتۆر محەممەد خالیدی

مەرگ حەققـە و ئـەوەی ئینسـانە دەمـرێ
ئـەوەی خـاوەن ژیـان و گیانـە دەمـرێ
مـەرگ کـوا بـاکی لاوە یـاخۆ پـیرە؟
هـــەژارە، خـــاوەنی ســـامانە دەمـــرێ
بـەڵـێ فـەرمـوودەیـی زاتی خودایـە
«ئـەوەی خێـوی ژیـان و مانـە دەمـرێ»
بەڵام ئـەم داخـە یـەکجار سـەوزە کاکـە
کـە مامۆسـتایێ هێشـتا جوانـە دەمـرێ
گەلێکیش هەن لە سـەر مـافووری نـەرما
لـە دەوری دوکتـۆر و دەرمانـە دەمـرێ
هەموو کەس بـۆی بـەداخـۆن و غـەمینن
دەڵێی مـردووی گـەل و جیرانـە دەمـرێ
بەڵێ هی واش هـەیـە لـەم کۆنـە کـەپـرە
سـەرینی بـەردی ژێـر عاسمانـە دەمـرێ
بەبێ شین گێڕ و خزم و کەس لـە چۆڵـێ
بـە سـەربـەرزی تـەواو کوردانـە دەمـرێ

بەڵام کاکە خەمی تۆ چۆن لە بیر کەم
لە دڵما یادی ڕێی زەنجانە دەمرێ
لە سەر تۆ من حەمە گیان چی بنووسم؟
لە دوای تۆ نرخی شیعری جوانە دەمرێ
قوتابیت پاکی چاو پڕ خوێن و ئاون
بزەی شادی لە سەر لێوانە دەمرێ
چلۆن «ئاسۆ»ت بەجێ هێشت و وەها زوو
لە مێشکم زەوقی ئەم هەستانە دەمرێ؟

سەقز ـ ٧٧/١١/٢٣

## دڵم ... دەشکێ

دڵم بەم وەعدە بێشوێنانە دەشکێ
قەڵەم نووکی لە تاو ئەم ژانە دەشکێ
وەها شەرتە کە شووشەی دڵ بڵاوێ
بە بەردی تانە هەر هاسانە دەشکێ
دەزانم ڕەنجی من بێسوودە چونکا
بە دەس مەیگێڕەکەم پەیمانە دەشکێ
ئەمن ئەو جوانپەرەستەی تینووەم وا
کە تینوویم بە چاوی جوانە دەشکێ
وەها ئاڵۆز بووە هەودای خەیاڵم
لە زوڵفی شیعرەکەمدا شانە دەشکێ
لە بێگانەی کەوێ تیشکی گڕی شەم
سکووتی سووتنی پەروانە دەشکێ
کە ڕۆژێ گەل بە ئازادی ببینم
لە نێو لەش ئێشی هەرچی ژانە دەشکێ
مەڵێن «ئاسۆ» بە هاوار و شیعارە
سکووتی بێکەسی ئینسانە دەشکێ

بۆکان- ٧٢/١٢/١

## ماندوو

بێوچان چەن ساڵە هەر دێم و دەڕۆم و نایگەمێ
هاوسەفەر گشت جێم دەهێڵن، بۆچ منیش گوێیان دەمێ؟
شەرتە ئیدی لەو هەموو جێمانە عیبرەت وەرگرم
وەک وەلی دێوانە بەم سووتانە سازی کەم شەمێ
خێڵ بەرەو خواری هەواری عاشقیمە و داخەکەم
هەر لە ڕوئیادا دواوم هەر نەبوو بۆم هاودەمێ
گەیمە سەر لووتکەی هەواری خۆشەویستی و تێدەگەم
سەددی سەر ڕێگامە ئێستا زەردوماهـ و ئەستەمێ
شادمانی هەر بە گۆشەی چاوی چاوم لێدەکا
جا کە وابوو بۆچی نەچمە ژێر دەواری هەر غەمێ
لێوی هەر لێوئاڵی ئاڵا هەستی شیعریم نەمگەزی
شەرتە ئیدی دەست بدا قەت نەبمە زۆری هەر کەمێ
کێ وەکوو من بوو بە پەروانەی جەماڵی هەر گوڵێ؟
کێ وەکوو من بوو بە ماسی هەر شەتاوی ماتەمێ؟
بوومە خولیای شەمسی هەر تەورێز و ورمێ و سەبزەوار
من چەما پشتم، کەچی ئەم ڕێگە پشتی ناچەمێ
یا ئەمن «ئاسۆ»ی ژیانی ئەم زەمان و عەسرە نیم
یا وەڕەز بووم لەم هەموو ناڕێکییەی بنیادەمێ

بۆکان_ ٨٠/٣/١٠

(...)

**بۆ مەرگی حەسەن**

ئەگەر هەستی دڵم بۆ تۆ بنووسم خۆم دەسووتێنێ!
ئەگەر باسی نەکەم چ بکەم؟ خەفەت جەرگم دەقرچێنێ
ئەگەرچی ویشکەساڵە و هەوری ئاسمان بێ بەزە و ڕەحمن
لە بۆ تۆ دێمی بەر چاوم لەبەر بارانە ژەنگ دێنێ
هەتا تۆم بووی لە ئەم ڕێدا هەموو کەس ئاشنای من بوون
بەبێ تۆ چاوەکەی چاوم! غەریبم دەچمە هەر شوێنێ
«حەسەن» ئەی هاوەڵی سەرتاسەری عومری ئەویندارییم
لە پاش تۆ شەرتە ئیدی دڵ بە دڵ هیچکەس نەلاوێنێ
چلۆن ئارام گرێ دڵمان کە ئامانجت بەجێ ماوە
بە ئامانجت نەگەی تۆخوا ئەرێ ئەم ژینە چی دێنێ؟
لە ئاسمانی خەیاڵی من شیعر هێند مات و دڵتەنگە
لە بۆ تۆ هەوری ئاسمانیش تکەی ئەسرین دەبارێنێ
دەڵێم هێند بێوەفایە ئەم ژیانە بۆ چ کەس نەگریم
بەڵام چ بکەم غەمی کۆچت لە هەستم سەر دەشێوێنێ!
وەرە سەر هەڵبڕە گیانە لە تۆی ئەم خاکە بێمەیلە
بزانە خوێش و بێگانە چلۆن بۆ تۆ دەناڵێنێ
زەوی ئەی لاشەخۆری بێبەزە و بێدڵ! هەتاکەنگێ
کە پاییز دێ دەڕووخێنی کەوێڵی تەیری گەرمێنێ؟

(حەسەن) گیان! تازە بێ تۆ من بەهار و پاییزم وەک یەک
گەڵارێزانە تا مردن مەگەر با بۆیی تۆ بێنێ
ئومێدی دیتنی دووبارەتە «ئاسۆ» هەتا مردن
بەڵام ئەم دیتنە پێموا وەکوو ئەفسانە دەنوێنێ

سوننەتە- پاییزی ٧٩

## بەهار لە پاییزدا

لــــە پـــاییز قومرییـــە وا (ســـکووتی) باغانـــە ئـــەشـــکێنێ
خــەیاڵــم شــەقڵــی بــێدەنگــی گــەلارێزانــە ئــەشــکێنێ
خــەزان ئــەوســاڵ بــەهــاری دووهــەمــی نیشــانی خــەڵــکی دا
ســکووتی کێــو و دەشــتی دەنگــی فیتــەی شــوانە ئــەشــکێنێ
بــەهـــاریش بــەم هـــەوای بێـــداد و زوڵـــمە تـــامی نامێنـــێ
کـــەوا زاڵـــم ڕیکـــۆردی کـــاری نامـــەردانـــە ئـــەشـــکێنێ
نە بولبول دەنگی وەک جاران بە یادی گوڵ لـە کێـو بـەرزە
نــە شــەختــە شووشــە پــەنجێــرەی چلــەی زستانە ئــەشــکێنێ
عـــەجایـــەب وەرزێ نامۆیـــە نـــە پـــاییزە، نـــە زســـتانە
شــەقــەی شاباڵــی کــۆتر و ســکووتی ئاسمانــە دەشــکێنێ
چ چـــاوەڕوانییەکـــت هـــەن لـــە ئـــەو ئیمانـــە قرچۆکـــە
کــە دەســنوێژی وەرەی ئاشــق زڕەی پــەیمانــە ئــەشــکێنێ
گوڵێ سوور لەم خەزانەی دا وەهای دڵخۆش بە ژین کردووم
شــەمــی مــن شــەوقــی ســەد شــەمعی وەلی دێوانــە ئــەشــکێنێ
ڕەدیفــیش تێــکبچــێ «ئاسـۆ» جـەحـەنـدەم هێنـدە عاشـق بـە
کـە هیچکـەس گـەرد و تـۆزی لاقـی ئـەم شیعرانە نـەشـکێنێ

ساروقامیش- ٨٥/٨/٢٠

## ئێحرامی ئەوین

هەتاکوو ڕوونە چاوت خۆت مەخە بەر تیری هەر چاوێ
حەیای خۆت لێڵ مەکە کاکە لە بۆ هەر شۆرەت و ناوێ
لە کابەی پاکی دڵداری کە ئیحرامی ئەوینت گرت
ئەدی سۆنەی چەم و ڕۆباری تەڕ نابێ لە هیچ ئاوێ
دەزانم خۆ گولاڵان بێوەفایە وەک تەمەن دەڕوا
بە چی دڵخۆش دەکەی بەم ژینە؟ هێندەی دوودڵیش ناوێ!
هەتاکوو خاڵی مەحبووبان هەبێ دڵ قەت مەکە خاڵی
هەتا ئەو شک بەری تۆخوا مەچۆ سەر دانی هەر داوێ
خەیاڵی خاوە خۆ گرتن لەبەر خۆری خوڕافاتا
هەتا پیرێ پەلت بگرێ پەنات بێ پەرچەمی خاوێ
ڕقی یەزدان لە عەشق و خۆشەویستی قەت نەبزواوە
بەوەی کافر دەبی بتبێت و نەگری دەستی داماوێ
ئەگەر خالق دەست بگرێ بەرەو ڕێی پاکی ئینسانی
کلیسە و مزگەوت و مەیخانە هێندەش بەینیان ناوێ
کەسیرە و بێپەنا ماوم لە ڕێبەندانی بێڕێیی
خودا «ئاسۆ»یێ ڕوون دەرخەی لە ئەم سەرمایەدا تاوێ

بۆکان- ٧٤/١١/١٧

## نامەوێ

عیلمـی بـێبـەهـرە و ژیـانی بـێئـەمـەل، مـن نامـەوێ
غەم بە خەڵوار و بزەش هەر چەل بە چەل من نامەوێ
ڕێگە دوور و مەنزڵت بـێشـوێن و تـۆش وا نابـەڵـەد
عیلمی کەم، گۆچانی دەست و لاقی شەل من نامەوێ
تاجی شاهی و تەختی خونکاری دەڵێن کەیفی هـەیـە
عاقیبـەت تاجـێ کـە بێتـە کاسـە کـەل مـن نامـەوێ
جـا دڵـێ وا بـێغـەور بـێ گـوڵ بڕووشـێنێ پلـەی
لـەو وڵاتـەی هـەر دڕوو دێتـە عـەمـەل، مـن نامـەوێ
باغی ئاواتی گەلـێ کـەس بـوو بـە دەشـتی بـێنـەشـە
شەرتە ئەو کێڵـگە و بـەیـارەی بێتـە زەل مـن نامـەوێ
چەهچـەهـەی قـومری لـەباغـا ئێسـتە تـەوقـی ملیـەتی
بـاخی بولبـول گـەر ببێتـە کـاخی قـەل مـن نامـەوێ
بای شەماڵ با ڕاشـەکێنـێ داری «ئاسـۆ»ی ویستـەکـەم
تـا نــەبێتــە داری ئــاڵا داری کــەل، مــن نامــەوێ

بۆکان_ ٧٦/٣/٨

## خەمی نویێ

حەیفە لەو شاخانەوە هەر قاسپەقاسپی کەو نەییێ
حەیفە لەو باغانەوە قرمژنی بازنەی ئەو نەییێ
ئەو دەمەی تێکەڵ دەبن حەیران و شمشاڵی شەپۆل
حەیفە لەو دەمدا چریکەی «پاییزەی» ڕێڕەو نەییێ
من دەزانم ڕەمزی ئەم زەردی و خەزان و سەوزییە
ڕۆژی ڕوون قەدری نییە، تا تاریکایی شەو نەییێ
ڕەنگی هەر نەخشی ژیانم خۆم بە تاقی کردەوە
پاکی بێڕەنگن هەتا لەو نوورە یەک پەرتەو نەییێ
دەک غولامی نووری ڕوخساری ئەوین بم چونکە هەر
ژین سڕ و تاریکە تا تین و تروسکێ لەو نەییێ
بولبولی باغی ئەوین بێتوو لە ڕۆمیش بیگرن
حەستەمە دەنگ و چریکەی لەوپەڕی وەرشەو نەییێ
هێندە کۆن و نویێ بە سەر یەکدا درا دەردی دڵم
دەردی کۆن ئێشی کەمە تاکوو خەمێکی نەو نەییێ
تینی هەڵبەستی شەوانەم هەر لە «ئاسۆ» هاتە دەر
ڕوون دەکا هەستی دەروون بێتوو بە ڕۆژدا خەو نەییێ

سارۆقامیش ـ ٧٧/٨/٢٥

## دەسنوێژی شیعر

لـە بـەی قرمـژنی بارانـەی خـەمـی شـیعرێکی سـەرشـێواو
کە دەس‌نوێژی شیعر دەگـرم بـە فرمێسـکی قـەتیسـی چـاو
لــە بــانگی بــەربــەیــانی‌دا کــە شــەونم شــوعلەهــاوێژە
ئەمن تەحیاتی وەسفی تۆم بـە کـوردی پـێ وەکـوو نـوێژە
بەڵێ گیانە پەریش وەک تۆ ڕەزاسووک، خوێن‌گەرم نابێ
لە پووشپەڕ ڕوومەتی خـۆریش وەکـی تـۆ پـڕ شـەرم نابـێ
ئـەگـەر مـانگی دەمـەو کـازیوە زەرد و زایـف ئـەنوێنـێ
پەڕیوە شەرتەکەی ئیدی کە ئـەرکـی خـۆی بـەجـێ بێنـێ
لـە تـاریکی شـەوا شـوعلەی دووچـاوت شـەوقـی ڕێگامـە
لــە غــەمخانــەی ژیــانم‌دا بــزەت هــۆی زەوقــی هیوامــە
کە سرتەی عەشقی تۆ بـە گـوێی پـەری‌دا شـەو نـەچرپێنم
بــە شــۆڕابەی تکــەی چــاوم ســوپای بارانــە دەشــکێنم
ئەگەر ڕۆژ دێ بـە یـادی چـاوەکانـت بـێ‌وچـان دەگـریم
کە شەو دادێ وەکوو ئەستێرە تـاکوو بـەربـەیـان دەگـریم
دەڵــێی بۆچیتــە ئــەم ناڵــین و شــین و دەرد و ئــەفغانــە!
بــە گریــان دادەمرکــێ ئــاگری ئــەم جــەرگــە بریانــە
لـە نێـو گریـانی تـۆدا مـن بـە دەنگـی دەردی خـۆم زانی
خەزانی مەیلی تۆم دی جا بـە ڕەنگـی زەردی خـۆم زانی
بـەڵـێ ئـەی شـێوە پـەریانـە! نموونـەی عـەشـقی جانانـە!
کەسێ دەرسـی ئـەوینی تـۆ نـەخوێنێ دوور لـە عیرفانـە
ئـەتـۆ «ئاسـۆ»ی بـەیانـانی شـەوی تاریـک و بـێ‌نـووری
بە دایم وای لە سەر زارم کـەچـی بـۆ هێنـدە لـێم دووری؟

بۆکان_ ٧٣/١١/١٦

## نەورۆزی ٧٣

نــەورۆز! نــەورۆز! جــەژنی پــیرۆز!
نــەورۆز جــەژنی نــەتــەوە و هــۆز!
نەورۆز! نـەورۆز! دڵـتـەنـگ پڕتـەم!
نــەورۆز جــەژنی گــەلی بــێخــەم!
تـۆ سـافی نیـت، لای مـن «دوردی»
هــەرچــەن جێـژنی کـۆنی کـوردی
پــێم دەڵــێن تــۆ ڕۆژی شــادیت
بــەڵام تێــیناگــەن، تــۆ وا نیــت
تـــۆ ئـــاگری، تـــینی، گـــڕی
سـەوزی، سـووری، لـە غـەم پـڕی
تـەقـەی، تۆقـەی، شـۆری، کـەچـی
گــەلان شــادن بــە ئێمــە چــی؟
یــادت هــەر دووکــەڵــە و ئــاگر
هــەر ئــەمســاڵ لــە پــار خراتــر
ڕاســـتە جێژنێکـــی زۆر پـــاکی
ڕۆژی بـــەنـــدی ئاژیـــدهاکی
بوومـــەبوومـــە نابێتـــە نـــان
جێی کورد ئەوڕۆ بـەنـدە و زینـدان
لـــەو ڕۆژەوە تـــاکوو ئێســـتا
لـــەو لای ســـووتانی ئاوێســـتا

نـەمـدی تـۆ جـارێکیش لـە جـار
خۆشـــی بـــێنی بـــۆ مـــەی هـــەژار
نەورۆز! نـەورۆز! نـەورۆز! نـەورۆز!
یــادت بــۆ ڕۆڵــەی گــەل و هــۆز
یــا «ســـنە» یــا «هـــەڵـــەبچـــەیـــە»
کۆتــە، بــەنــدە، کــەلــەبچــەیــە

❋❋❋

نەورۆز جەژنی پڕ هـەسـت و سۆز!
دنــەی شــیعری هــەســتی ئاڵــۆز!
پـــێم دەڵـــێن جـــەژنی ئێمـــە نی
ڕاس بــێ یــان درۆ بــە مــە چــی؟
کــاوە خــراپ، جــەمشــید خاســە
فــەرەیــدوون خــۆ خــود نــەناســە
بـــە ئێمـــە چـــی؟ ســـەدان ساڵـــە
حاڵـــی ئێمـــەیـــە ئـــەم حاڵـــە
کـــــە نـــــەورۆز دێ خۆشـــــیمانە
فـــــەسڵـــــی بـــــادەنۆشـــــیمانە
گڕ بەر ئەدەیـن لـە سـەرما و سـۆڵ
دەچینـە دەشـت و سـەحـرا و چـۆڵ
پێــت وا هــی بــێکــەســەرییــە؟
نـــەخێـــر، هـــی دەربـــەدەرییـــە

**دەسنویژی شیعر**

سالــەهایــە بــێ جــێ و ڕێگــەیــن
ڕێمان دیار بێ، شـەو بێجێگـەیـن
دەڵـــێین ئاشـــتی! دەمـــانکوژن
ماڵـمان ئـەدرێ سـەنـگ و سـووژن
بـــزە لـــە لێومـــان قاچاخـــە
میداڵـــی ســـەر شـــانمان داخـــە
گوڵاڵـــەمـــان خـــوێنی لاوە
دارمـــان بـــە خـــوێن ئـــاو دراوە
مـــن پێـــت ناڵـــێم ڕۆژی دڵســـۆز
یـــادت بـــۆ ڕۆڵـــەی گـــەل و هـــۆز
هـــەر زینـــدان و دار و بـــەنـــدە
بـە دزی گریـان، ڕواڵـەت خـەنـدە

***

ئێـــوارەیـــە، شـــار پـــڕ دووکـــەڵ
دەروونی ئـەمنـیش وەک مـەنجـەڵ
لـە بـادەی تاڵـی خـەم سـەرخـۆش
خۆشـــی ساڵـــی نـــوێ فـــەرامـــۆش
سەربان هەر گـڕ، دەروون هـەر گـڕ
کووچـــە ئـــاگر، وڵات قاقـــڕ
مۆســـیقا نـــەوای دڵتـــەنگـــی
وەزنی شـــیعر بـــێئاهـــەنگـــی
دەوروبـــەر و ســـەرمـــان درۆ
ســیس وبــێئــاو نــەمــام، چــرۆ

## محەمەد سەعید نەجاری (ئاسۆ)

کـــانی ویشـــکە، ڕۆبـــار لێڵـــە
شمشـــاڵژەن شـــین گێـــڕی خێڵـــە
کوڕمـــان ئـــەوەی تێگـــەیشـــتوون
ئـــــەوانـــــەی وا پێگـــــەیشـــــتوون
لـــەگـــەڵ شـــۆڕەکچـــان ڕەشـــپۆش
ئـــەوانـــەی دی مـــەســـت و بـــێهـــۆش
منـــیش پـــیری دەســـت ئـــەم ڕازەم
نـــەورۆز نـــەڵـــێی ساڵـــی تـــازەم
چـــەن ساڵـــە کۆنـــەیـــان کـــردووین
بە سەر زیندووین، بـە دڵ مـردووین

***

بـــە تـــازەبـــوون دەڵـــێن نـــەنگـــە
گریـــان لای ئـــەوان ئاهـــەنگـــە
یـــان دەبـــێ ئـــەهلـــی سامان بـــێ
یـــان ئوســـتادی لـــەخـــۆدان بـــێ
ڕەنگ نـین سـوور و شـین و ئـاوی
دەڵـــێن ڕەشـــپۆش بـــە تـــا مـــاوی
منـــیش چ بکـــەم بـــێ مـــەوتـــەنم
بـــێ ئـــاڵا و مـــاف و مـــەســـکەنم
گەر دەڵـێم لـەل جـێم چاڵـی ڕەش
جەزای خـەنـدەم فرمێسـکی گـەش
پێـــــــدەکـــــــەنم تاوانبـــــــارم
پـــەشـــێو بم دەڵـــێن نـــەیـــارم

## **دەسنویێژی شیعر**

ئـــاگر هـــەڵـــکەم نـــەتـــەوەیـــیم
قورعانخوێن بم، کاکئـەحمـەیـیم
کۆمۆنیســـــتم ڕیـــــش بتاشــــم
ڕیـــش بێڵـــمەوە هـــاوڕێی جاشـــم
نەورۆز! من کوردم، کوردی ڕووت
لەتـاو ئـەم دەردە جـەرگـم سـووت
کـوا بـێمێـژووم؟ کـوا بـێدیـنم؟
وەک ڕۆژ ڕووناکـــــە ئـــــایینم
گـەر ئـاگر هـەڵـدەکـەم ئـەمشـەو
پـەنـا بـۆ مـەی دەبـەم ئـەمشـەو
ئاومالْـــکی خـــەو دەســـووتێنم
هـەناسـەی سـارد وە جـۆش دێـنم
دەچمـــــە هـــــەلاوە مـــــەلاوە
لـــە جـــەژنی جـــەمشـــید و کـــاوە
دەڵـــێم هـــەتـــەرێ مـــەتـــەرێ
دەپرســـــم هـــــەتانـــــە ئـــــەرێ؟
خۆ سوالْکەر نیم، خـۆ دەجـالْ نـیم
عاشـــقی گـــڕە مشـــقالْ نـــیم
دەڵـــــێم هـــــەلاوە مـــــەلاوە
بـــەشـــی کوردانیـــان نـــەداوە

بۆکان ـ ١٣٧٣/١/١

## نەورۆزی ٨٣

نـەورۆز! نـەورۆز! جـەژنی پـیرۆز!
نـەورۆز جـەژنی نـەتـەوە و هـۆز!
نەورۆز! نەورۆز! سەرساڵی کورد!
ڕۆژی شـــادی منداڵـــی کـــورد!
نـەورۆز! نـەورۆز! جـەژنی دێـرین!
تـــەواو بـــوو دەورەی نـــاوێرین
نەورۆز! نەورۆز! خۆشحاڵ، دڵشـاد
نـەورۆز! جـەژنی تـۆرەمـەی مـاد!
تـۆ دوردی نیـت عـەیـنی سـافیت
بـــۆ ئـــازادی کـــوردان کافیـــت
لـــە بیرتـــە ساڵـــی حـــەفتاوســـێ
خـــــزم و جـــــیران و دراوســــــێ
لـــە ترســـی ئـــاگر هـــەڵکـــردن
خســـــتمانیانە حاڵـــــی مـــــردن؟
ئـــەو ساڵـــە دەموت تـــۆ وا نیـــت
دەنـــا تـــۆ هـــەر ڕۆژی شـــادیت
ئێســـتا ساڵـــی هـــەشتاوســـێیـــە
مزگێنییـــــەکـــــی تـــــازەم پێیـــــە
ئەوسـاڵ غـەممـان فـەرامـۆش بـوو
شۆڵەی ئاوری شـەڕ خـامۆش بـوو

ئێمـەیـش وایـن لـە ڕێـزی گـەلان
لـــە وەرزی ئـــازادی مــــەلان
دەچینـە دەشـت و سـەحـرا و دەر
هـەوای غـەم لادەبـەیـن لـە سـەر
نـــەمـــا دەورەی دەربــــەدەری
دەربــــەدەری داینــــا ســـــەری
کـــورد دەورەی دیلـــی ڕابـــرا
گێلمــــە و تـــەعـــال وەلا خـــرا
پێمـــان نالـــێن ترکـــی کێـــوی
پێمـــان نالـــێن جـــنی و دێـــوی
زەمانمـــان ڕەسمـــی ڕەسمییـــە
کـوردیش هـەروەک ئـارەوییـە
زەردە قـــۆڕە و وشــــتر ئیـــدی
نامـــانچـــەوســـێنێتەوە چـــی دی
داری بــــەڕوو لــــە لێـــــڕەوار
خـــەڵــفی داکوتــاوە بــە هـــەزار
مـازوو و گـوێز و تـوو شـیرینتـر
ئـەوسـاڵ پـەل دەردەکـەن ئیتـر
هـــەوری ئاوســـی پـــڕ بـــاران
تێـــراوی کـــردوون بـــە یـــاران
کوێستان پـڕ لـە قاسـپەی کـەوە
کـەنـد و لـەنـد و ڕژد و گـەوە

ڕەزمـــان كـــراوە تـــەكمیشـــی
چـــاو كـــە پـــاییز و كشمیشـــی
شـۆڕەبی وەک زولفــی چاوكـاڵ
قـــژی داهێشـــتووە تـــاڵتـــاڵ
باغاتمـــان گوڵـــیان زووتـــر دا
فـــەرشـــی چـــەمـــەن زوو ڕاخـــرا
ئـــەوســـاڵ ئاڵامـــان دەشـــەكـــێ
چـــەنـــدئاڵایی بۆتـــە یـــەكـــێ

***

نـــەورۆز! كـــوا قاســـیدی دڵســـۆز؟
تـــا پـــەیـــامی جـــەژنی پـــیرۆز
یـــان بـــە كـــارەبـــا یـــا شـــەمـــاڵ
لە هـەر چوار پارچە ماڵ بە ماڵ
لەگەڵ چەپكێ گوڵاڵـەی سوور
بچێتـە هـەڵـەبجـەی شـارەزوور
لـە سـەر هـەر شـەهیـدێ چڵـێ
لـە سـەر هـەر گڵـكۆیێ گوڵـێ
دانـــێ و ســـەری دانـــەوێنـــێ
ڕەسمـی فـەرەنگـی جـێ بێنـێ
خەڵفێ گەر بە خوێن ئاو بدرێ
بـە جێـی بـەر ئـازادی دەگـرێ
ئـەو خوێنانـەی ڕژا سـەر گـڵ

ئێستاکە بوون بە داری گوڵ
سوور هەڵگەڕاوە ئالای کورد
لە سەر دوندی چیای هەڵگورد
لەویێوە بچێتە ئاگریداغ
ڕاوەستێ بەرانبەر سابلاغ
لە نێو سابلاغ بورجێ دیارە
چاوەڕێی پەیامی یارە
«هەژار» چاوەڕێی پەیامە
«هێمن ماتڵە، ها! نامە!!
مامڵێیە وەک بەحری بێ بن
قەتار دەڵێ بۆ مام هێمن
تەڵێ بکا لە ناڵەشکێنێ
با زیرەک وە خەبەر بێنێ
بڵێ بە سوارە و حەقیقی
بە سەید کامیلی ڕەفیقی
وەک جەژنی دەورەی جەمهووری
یەک گرنەوە هێدی و نووری
مەلا غەفوور چاو پڕ ئەسرین
لە تەنیشت گۆڕی «خاڵەمین»
گوێ بە ئاوازی ئەم زەنگەن
تامەزرۆی بیستنی ئەم دەنگەن

***

نـــەورۆز مـــن زۆر قســـەم پێیـــە
دەزانم تـۆش جـوان گوێـت لێیـە
ڕاســتە تـۆ وەک ئـاگر سـووری
بـۆ مـن وەک بـەردی سـەبـووری
گــوێ بگــرە بــۆ ئــەم داســتانە
«فێدڕاڵــی بــوو بــە جــەژنانــە»
قــــاڵاوانی دڵڕەشــــی پــــیس
لەگـەڵ دوژمنانمـان دەسـتکـیس
خــەریکــن لێمــان تــێبــدەن
دڵــنیام ئــەوان تێــیناگــەن
لــە ئــازادی دڵ بــە قیــنن
مــەرگــی خــۆی تێــدا دەبیــنن
ئێستا کـوردان زۆر یـەکگرتـوون
وان لـە فیکـری یـەکپارچـە بـوون
گــەورەکانمــان دڵســۆزترن
ســەگــە هــار منــداڵ نــاگرن
میللــەتمــان کاتــێ دەخــەوێ
ناترســێ لــە مۆتــەی شــەوێ
پســاوە بــەنــد و کــەلــەبچــە
باغچــەی لاوانــە هــەڵــەبچــە
لـە سـەر مـەزاری هـەر شـەهیـد
داری ســەوزە و نــوقڵ و نــەبیــد

بـــای شـــەمـــاڵ پـــەیـــامی پێیـــە
بـــۆ هـــەر جێیـــێ کـــوردی لێیـــە
بـــۆ ئـــاڕاڕات، بـــۆ داڵاهـــوو
بـــۆ قـــەنـــدیل، بـــۆ بـــان هۆبـــەتـــوو
فێنکـــایی ئـــازادی کـــوردان
دێنێتـــە نێـــو وادی کـــوردان
وا کونـــدەبـــوو مـــاوەیێکـــە
ویڵـــی نێـــو کـــەلاوەیێکـــە
گـــیری ناکـــەوێ کـــەلاوە
لـــە ترســـی تـــۆرەمـــەی کـــاوە
لـــە دەشـــت و مێـــرگ و چیمـــەنـــان
لـــە ئاوهـــەڵـــدێر و دیمـــەنـــان
دەنگـــی قاقـــای چـــاو کاڵانـــە
خرینگـــەی بازنـــە و خرخاڵانـــە
«کـــانیئاســـکان» کانگـــەی ئاســـکە
«ســـەرچنـــار» جـــێژوانی ناســـکە
«قـــەرەداغ» قـــۆپی و ســـەرچـــۆمی
تێکـــەڵاو بـــوون ســـەیـــد و ئـــۆمی
«هەورامـان» سـەری گـەییـە هـەور
ســـەگـــی هـــاری ڕەوی لـــە دەور
چـــەتـــووە عـــەگاڵـــەی عـــارەبـــان
لـــەگـــەڵ جامانـــەدا بـــران

ڕۆژی کورد تیشک دەهاوێژێ
ئیدی کورد خوێنی ناڕێژێ
بەجێی هاوار و واوەیلا
دێ ئاوازی لەیلا لەیلا
نەورۆز! نەورۆز! نەورۆز! نەرۆز!
نەورۆز! جەژنی نەتەوە و هۆز!
ئەمساڵ ئاڵامان شەکاوە
دەورەی کوردقڕان نەماوە

***

نەورۆز! جەژنی نەتەوە و هۆز!
ڕۆژی ئازادیت لێ پیرۆز!
نەورۆز! نەورۆز! خۆشحاڵ، بێخەم
لە سەر چیات ڕەویوە تەم
هەشتی مارچ دووهەزار و چوار
بوو بە مێژووی کوردی هەژار
جێی خۆیە نەسڵی داهاتوو
بیکەن بە مەبدەئ بۆ مێژوو
مژ ڕۆییشت و ڕووڕەشی برد
هەتاو ئاسۆی ڕووناکتر کرد
هەڵاڵە و سوێسنە و شەوبۆ
وەدەر کەوتوون لە دەشت و کۆ

## دەسنوێژی شیعر

بولبول دەنگی حەیرانی دێ
قومری هەستاوەتە سەرپێ
خاسەکەو بزەی دێ بە داو
خۆی داوەتە بەرتیشکی تاو
دەخوێنێ لەو شاخ و بەرزە
دەماوەند دێنێتە لەرزە
منیش بەم شیعرەی نەورۆزم
مزگێنی دەبەم بۆ هۆزم
ئەم ماڵ، ئەو ماڵ، ئەم بان، ئەو بان
دەگەڕێم کووچ و کۆڵانان
دەبا قوتابیانی پێشووم
بە شێتەشێت بکەونە دووم
دەڵێم بەوەی دڵخاوێنە
من! شێتەکەی ناڵەشکێنە
ئێستا مزگێنی بەهاریم
پێیە لە بۆ کوردەواریم
دەڵێم هەتەرێ مەتەرێ
کێ ناڕەزایە چاوی دەرێ
ئۆخەی هەلاوە مەلاوە
ئەوساڵ بەشی کوردیان داوە!

بۆکان_ ٨٣/١/٤

## هەڵمی فرمێسک

بۆ کۆچی مامۆستا حەقیقی

لەسەرمدایە هەوای هەڵبەستێ
هەڵمی فرمێسکی لە واژەی هەستێ
تاو و تێی ئاهی دەروونی گڕ بێ
گەشە فرمێسکی دڵێکی پڕ بێ
شەونمی شیعری حەقیقی و کوردی
بدرەوشێ بە درشتی و وردی
وەکوو دوڕ بێ نە کەفی سەر ئاوێ
هەستی بێهەستی لە سەر دەرباوێ
بێتە بای فێنکی دڵی گڕگرتوو
بێتەوە ناڵەیی شمشاڵی گەروو
هەمیسان دەردی جودایی بێ گلەی
جەوهەری چاوی شیعر بێتە کلەی
پێی بڕێژم خەفەت و چاوی تەڕم
کەچی هەر وایە لە بەر بەختی شەڕم
لێم دەتۆرێ پەری شیعری ئاوا
کاتێ مامۆستا دەکا ماڵاوا

***

لــە دڵــمدایە خــەمــی خــەمخــۆریێ
هاتــە ســۆ کۆنــە بــرین ناســۆریێ
لــە هــەمــوو لایــێ ئــەگــەر دەڕوانم
شــیوەنی شــیعرە بــەڵــێ دەیــزانم
لــە دڵــی پــاکی بــەجــێماوانــدا
هــەر نــە پــیران، لــە دڵــی لاوانــدا
تۆزی کۆچباری حـەقیقـی هۆنـەر[19]
بووە توێژی خەفەت و کـردی سـەر
هێدی غەمناکە کە ڕۆیـی پیشـەنگ
«نووری»ە مات و پەشێو و دڵتەنـگ
«عەتری» هەڵبەستی بە وێنەی نووری
بەرگی ڕەشپۆشـی بـە بـەردا دووری
کـەچـی لـەو لاوە بـە خێـری دێـنن
بــە زمــانی پــەرییــان دەیــدوێنن
خاڵــەمــین بــاوەشــی بــۆی ئــاوالا
کاک هــەژار هــەر دەشــەکێنــێ ئـاڵا

١٩) مامۆستا بە لاوی نازناوی «ع.هۆنەر» بووە.

مامـە هـێمن دەڵـێ مـزگێن «ئـاوات»
کوانێ «حافز» کە حـەقیقـیش وا هـات!

***

لەوپەڕی هـەستی چلـۆنی و چـەمـەرە
دوور لە هەر خۆف و خەیاڵ و خەتەرە
هەمیسـان چـەشـنی پـەپوولـەی بـێئـاو
بـاڵ دەگـرن و دەفـڕن ڕوو بـە هـەتـاو

***

دەست دەلەرزێ دەڵێ چی ئینشا کەم؟
چـۆن دڵـم دێنـێ کـە مامۆسـتاکەم
شینی بۆ بکەم کە پەپوولەی دین بـوو؟
هەڵوەدای بـەحـری خـودا ناسـین بـوو
ڕوونە لێم ڕۆحی لە فیردەوسی بـەریـن
بە بزە پێم دەڵێ قەت بۆم مـەکـە شـین
مـن کـە شـینگێڕی گـەلم، هـەر بۆیـە
حـەوەجـێم کوانـێ بـە شـینی تۆیـە

***

وەرە هـاوڕێ وەرە گـوێم لـێ بگـرە
ئـەو دەمـەی تـیری خـەتـام تـێبگـرە
مـەڵـێ بـۆ شـیعری ئـەتـۆ هـەر شـینە
بــە خــودا تــەبعــی تــەڕم ڕەنگینــە
وەلـێ کاتـێ کـە شـەمـی کـووژاوە

**دەسنویژی شیعر**

شــەوی ڕەش پــەردەیــی خــۆی داداوە
چــۆن پــەپوولــەش نــەچزێنــێ باڵــی؟
«بـای نـەمـان هـات و شـەمـی داماڵـی»
دیــارە هــەر تــاوێ دەبــێ ئــاوا بــێ
مەرجی ئەو مـەرجـە ئـەگـەر ئـاوا بـێ!
تیشــکی هــەســتی لــە دڵانــدا هــەر وا
نــوور بــدا و بێــت و بچــێ بــێپــەروا
شــیعری تــۆ تــاوی دڵــی «ئاســۆ»یــە
ئاســۆ هــەر چووکــە قوتــابی تۆیــە

بۆکان- ۷۵/۱۰/۲۸

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

## لەگەڵ بولبول

**بۆ ڕۆحی گۆرانیبێژی دەنگخۆش، نەمر بەڕێز محەممەد مامڵێ**

بولبـول! باڵـندەی ئێسـکسـووک!
سینگ پڕنەوای دەندووک بچووک!
ئـــەوینـــداری گـــوڵ و گوڵـــزار
لــە ســەرمـا و بــێدەنگــی بێــزار
تینــووی خونـاوەی پــەلکــی گــوڵ
ســـروودخوێنی مـــەدرەســـەی دڵ
شـــەیـــدای بـــەیانـــانی بـــەهـــار
دڵ پـڕ ناڵـەی کـۆ بـووی شـەوگـار
ســەربــەســتی بـادەی ئـاوەنگــی
شــارەزای کووچــەی دڵتــەنگــی
بـــۆچی نـــەوا و ناڵـــەت نایـــە؟
دیســـان بـــەفــرە و هـــاژەی بایـــە
دیســـان ســـیخوارە و خـــەزەڵـــوەر
دیســـان کـــراوی بـــاخبـــەدەر؟
دیســـان ســـابڵاخ ســـەر بـــە تـــەمـــە
ئۆپێـــڕای ســـەنفـــۆنی غـــەمـــە
دیســان دوور کــەوتی لــە خۆشــی
یان تـۆش بـۆ «مامڵـێ» ڕەشپۆشـی؟

نالــێی چــین ئــەم گــەرمــەشــینە؟
بــۆ نالــەی گــەرووت غــەمگینــە؟
بێــری شــیری لــێ نــەڕژابــێ؟
«مریـــەم» ڕەشـــی نـــەپۆشـــابێ
یـــانی ئـــەم شـــین و گریانـــە
هـــی بێـــری کـــانیئاســـکانە؟
یـــان مـــام «هـــێمن» ئینتیـــزارە
هـــەر چـــاوەڕوانی «قـــەتـــارە»؟

***

بولبــول! باڵــندەی پــڕ ئاهــەنــگ!
ئــەی گــۆرانیبێــژی دڵتــەنــگ!
وەرە بـــا هـــەڵـــکەیـــن پێکـــەوە
گــەر ســەرمایــە و ئــەگــەر شــەوە
بــە ئاهــەنگــی مووســیقای ئــاخ
بگـــرین بـــۆ بولبـــولی «ســـابڵاخ»
بگــری، نمنم، تــوێتــوێ، وردورد
بـــۆ مۆســـیقای ڕەســـەنی کـــورد
گریـــان، هـــاوار! هـــەســـت ناهێڵـــێ
ئـــاوارە بـــووم لـــە دوای خێڵـــێ
دەڵـــێن کـــێ تـــازە وەک جـــاران
خـــۆش دەکـــا مـــەجلیســـی یـــاران؟
چـــاوی شـــیعر چـــۆن نـــەکـــا گـــل
لـــە گریـــانی مـــەرگـــی بولبـــول؟

هــاوڕێ تــۆ بی خــوا لــێم گــەڕێ
چـــاوی ڕقـــت دەرنـــەپـــەڕێ
ڕاســتە تــا گــوێی ئاهــەنــگ مابــێ
تــا بیّــری شــۆخ و شــەنــگ مابــێ
تـــا بیّـــری شـــیری نـــەڕژێنـــێ
«ماملــێ» نــەمــره و هــەر ئــەمێنــێ
بــەڵام چ بکــەم ئــەشــكی ڕوونم
ئاشـــــكرای دەكـــــەن دەروونم
كــۆچی یــاری، كــۆچی ســووره
كــۆچی ئــەم كــۆچی ســرووره
كـــۆچی ســـروور غـــەمهێنـــەره
مـــەینـــەتهـــێن و شـــادیبـــەره
هــەرچــەن هێنــد دڵتــەنگــی نــاوێ
تـــا ڕۆژ گزینگـــــی دەهـــــاوێ
تــا هــەتــاو هــەڵــبێ لــە «ئاســۆ»
نــامرێ دەنگــی ئــەو هــاوڕێی تــۆ!

بۆكان ـ شەوی ٣ی ڕێبەندانی ٧٧

## وەنەوزی ئارەزوو

ئـەی تریفـەی شـەوقـی ڕێنـوێنی نیـاز!
ئەی هەناسەی سرکی بن چارشێوی ڕاز!
ئـەی شـنەی ئـاواتی ڕۆحـی بـەربـەیـان
ئەی لـە سـێبەر ڕەمکـەری پـەیـتی ژوان
وەک خەیاڵم دێیە بەر چـاو جاربـەجـار
وەختـێ تێـک دەڵـقێ نیگـا بـێئیختیـار
تـۆ تکـەی ئـاونگی چـاوی ئـارەزووی
بەم چلـەی هاوینـە بـۆ ڕۆحـم تـەزووی
سـێبەری تـۆم بـێ بـەهـارم بـۆ چییـە؟
سـێبەری بـن تاقـەدارم بـۆ چییـە؟
ئەی تریفەی چـاوی سـەوزی ئـارەزوو!
بـاوەشـت جێگـەی وەنـەوزی ئـارەزوو!
جێی شەوانت هـەوری سینگی ئاسمـان
ڕێی ژوانـت سـەر شـەقـامی کاکـەشـان
بـۆ دوانـت کـۆڵ ئـەبـێ تیغـی زمـان
چاوەکەت زنجیر ئەکا چەرخـی زەمـان
جـا لـە کـاتی داوەت و سـەیـر و سمـڕ
خۆی دەسووتێ بۆ شـیعر پێنووسـی گـڕ
هـەر نیگاییکـت لـە چـاو دەشـنێتەوە
دەرکـی شـیعرێکم لـە ڕوو دەکرێتـەوە

چاو ئەدرکێنێ قسە و پاشگەز دەبێ
گڕ دەهاوێ و دوایە خاوەن تەز دەبێ
تۆ ئەگەر چاوت ئەوین حاشار ئەدا
بۆ تەزوو دێنێ بەم ئەم بێچارەدا؟

***

ئەی لە گوڵواژەی شیعر جوانتر بزەت!
چاو بزی هەورێشم ئەو بسکە خزەت!
هەستی تۆ گەر بێتە دەسنوێژی شیعر
ئەو دەمەی هەست پێدەکەم چێژی شیعر
هەر وشەی ڕاوی دەکەم بۆت زۆر و کەم
پاکی هەڵدەخزێ ئەگەر ناوت دەبەم
گەر خەیاڵت بۆ شیعر دەبنە هەوێن
واژە بێ گۆڕین بە دووی یەکدایە دێن
دەنگی خۆشت گەر لە گوێم دەنگدداتەوە
هەر شریتێکی هەمە دەیشواتەوە
چ بکەم ئاخر بۆ دڵم ساز و نەوای؟
چەندە لێک دوورین ئەوەندەش ئاشنای!
تۆ هەوێنی شیعری تازەی ئەمشەوی
ئەو کەسەی من هەڵوەدا بووم بۆی ئەوەی

***

لێم گەڕێ بێ پەردە هێندێ شت بڵێم
من لەگەڵ ترس و هەوەسدا ناکوڵێم

## دەسنوێژی شیعر

ئـــاگری عیشـــقێ لـــە ســـینەم بـــەر بـــووە
تێکەڵی خـوێن، بـەڵـکە تـا ئێسـکم چـووە
بۆیـە تـۆم کردۆتـە سـەرمـەشـقێ لـەوێ
چونکە لەو خاکەیت و پـەروەردەی ئـەوێ
من پەپوولـەی شـەوقـی تـۆ و ئـەو ئـاگرەم
تـــا دەســـــووتێم زۆرتـــــرە تـــین و ورەم
بۆیـــە ناترســـم کـــە بمکاتـــە خـــەڵـــووز
سەوز و سەختە عیشقەکەم وەک دارە بووز
گـەر لـقوپـۆی پـاکی هـەڵـپاچن بـە زۆر
سەد لـقوپـۆی دیکـە دەڕوێ نـۆر بـە نـۆر
مـــن بـــەهـــاری ئـــەو قوتـــابیخانـــەمـــە
فـــەسڵـــی هـــاوینی هـــەوار و لانـــەمـــە
پـــاییزی ئـــەو فێـــری کـــردم پـــاییزە
هـەر کـراس زەردێ کـە دیم دێمـە بـزە
مـن بـە ڕێبـەنـدانی ئـەو گـەرمـە دڵـم
هێـز و تـین و عـەشـق و تـاو و ئـەسکڵـم
شـیعر و عـەشـقی لاوەتیشـم هـەر لـەوە
حـەول و دەولم گشـت لـە پێنـاوی ئـەوە
جا ئەگەر مـن هێنـدە مـەدحـی تـۆ دەکـەم
هێند وشـەی تـازە و نـەبیسـراو کـۆ دەکـەم
چ بکەم ئاخر تۆ کە وەک کانی و کـەوی
ڕۆحی «ئاسۆ» و دەسـتەپـەروەردەی ئـەوی

بۆکان_ ٧٤/٧/٦

## یەکی ئەیار

هاتە گویم دەنگێ هەوەڵ ڕۆژی ئەیار
ئەو دەمەی وا بووکی ڕازاوەی بەهار
خۆ دەلەنگێنێ وەکوو تاووس کەژی
سەیرە بێڕۆحیش لەوێ دەمدا نەژی
دەنگە زیندوو بوو بەڵام گڕگڕ ببوو
تاری ئەوکی بۆ وتارێ سڕ ببوو
جا پەنابەر بوومە بەر گوێچکەی قەڵەم
پێی گوتم بۆ دەنگی ئاوا ئاوەڵەم
هەم دەبیستم، هەم دەنووسم ئەم هەرا
تا هەڵیبگرن لە سندووقی سەرا
دەنگی وەرزێرێکی ڕووتی ئاشنا
وای دەکوت خۆشخۆش لە نێو ناخی منا:
«دەستی پڕ هێزی گەلی ماندوو نەبێ
چۆن بەراو و دێمی گەل پڕ توو دەبێ؟»
هەر منم دامچاندووە دێم و بەراو
دەستی ماندووم تەنگ و سینگی خەم هەراو
ڕووتەڵە و بێ کەوشە خوێنی جەرگەکەم
هەر دڕاو و پینەبارە بەرگەکەم
شەو لە بەر ئێشی جەمامی دەستەکەم
نارەناری دەرد و ژانە بەستەکەم

بـۆچی پـێم ناخۆشـە مـن پـارووی چـەور؟
وا دەبـــێ بـــۆ مـــن بچێتـــە بـــن هـــەور؟
بـــۆچی منداڵـــی ئـــەمـــن دێوانـــەیـــە؟
ســـەر تـــەپۆڵـــکانی قوتـــابیخانـــەیـــە؟
لـێم گـەڕێـن ئـاخر دڵـم یـەکجـار پـڕە
قـەڕنی بیسـتەم ڕۆیـی مـن خـانووم قـوڕە
کەم دڵم خۆش کەن بە مـزگێنی و بـەڵێن
ساڵـــەهایـــە هـــەر دەڵـــێن و هـــەر دەڵـــێن
هـــەر دەڵـــێن و بـــۆ ئـــەمـــن نابێتـــە نـــان
هێنـــدە ئـــەم دەردانـــە بـــۆ مـــن ئاشـــنان
تـازە ئیـدی سـەرکـوتم ناکـەن بـە زۆر
نایـەڵـم ڕەنجـم بـە بـا دا مفتـەخـۆر
مستی پـۆلام دایـدەچێنـێ تـووی خـەبات
نـان و بـەرگـم بـۆ دەهێنـێ وەک خـەلات
ژیـن بـەرەو پێشـێیـە «ئاسـۆ» ڕوونـە بـۆم
چـۆن دەبـێ بـنبـڕ نـەبـێ دەرد و دڵـۆم؟

ساروقامیش ـ ٧٥/٢/١١

## تۆزی غوربەت

**بۆ هاوڕێم حەسەن دەرزی**

وا خــەزان دیســان لــە بــاغی مــەجلیســی یــاران خــزا
جــەرگــی هــاوالان بــە ســیخی دوورەیــاری هــەڵــچزا
سۆزی ئەو سازەی کە وا هەر نەشئە بـوو ئاهـەنگـەکـەی
تازە لـە گـوێی هـاوەڵانـدا چـوو غـەریـبی دەنگـەکـەی
«دەردی دڵ بۆ کێ بەیان کەم»؟ کێ لـە دەردم حاڵـییە؟
وەزنی شـیعری عاشـقی مـن دەنگـی کـێ هاواڵــییە؟
«بــەفـری بـەفرانبـار لـە سـەر شـیعری ئـەمـن ناچێتـەوە
تۆ بڵێی کـەنگـێ عـەزیـزی ئـەو دڵـەی تـۆش بێتـەوە»؟
ئـەو دڵـەی تـۆ بـۆچی هـەر دایم لـە غـەم پـڕ بـوو بـرا؟
گەرچی بۆ ڕووناکی بەزمـی ئێمـە سووتای وەک چـرا
تـــۆ بڵـــێی شـــادی لـــە ئێمـــە بـــۆچی ناکاڵـــێتەوە؟
چـۆن نـەقـرچێم تـازە «کاڵـێم» قـەت لـە بـۆ ناڵـێتەوە!
دەردی دووری تۆ چ بوو وا هـەر بـەتـین‌تـر بـوو ورەت
تـا نـەڕۆییشـتی ئـەمـن حاڵـی نـەبـووم لـەو ئـاگرەت
ئێستە زانیم سۆزی دەنگـت بـۆچی وەک ئـاگر دەچـوو
تـا بـە فرمێسـکی غـەمـت نمنـاک ئـەبـوو چـاتر دەبـوو
ئێستە زانیم دەردی ئـەم کـوردە وەکـوو هیچکـەس نییـە
لێی نەنیشێ تۆزی غوربـەت سـەد هونـەر بـێ بـەس نییـە
«ئێســتە زانــیم چــاوەکــانم نــاوەرۆکــی شــیعری غــەم
ڕۆشنیش بێ ویژەری خۆی پێی دەسووتێ چەشنی شەم»

**دەسنوێژی شیعر**

هـاوەڵان! مـەنعـم مـەکـەن شـیعرم پـەیـامی شـیوەنـە!
پاکی جێی پێـی هـاوەڵانـە هـەرچـی دەشـت و دیمـەنـە
هـەرکـەسـێ جـوێ بێتـەوە لـەو خۆشـەویسـتانەی دڵـی
بولبــولی پاییزییــە و هــەر شــینە کــاری بــۆ گوڵــی
شیعری مـن وەزنی نـەمـاوە هێنـدە قورسـە ئـەو خـەمـەم
بۆنی شـین و شـیوەنـە ئاهـەنـگ و بـەسـتە و زەمـزەمـەم
تـازە کـێ ڕوونی دەکـا «ئاسـۆ»ی خـەیـاڵاتی گـەشـم؟
شەرتە ئیـدی چـەشـنی قـومری ناڵـە بـێ هـەر وا بـەشـم

بۆکان- ٧٧/٩/٨

## هەورامان، هەوری بارانی شیعرە

کۆمـەڵـە شـاخێ وەک سـەیـد سـەرسـەوز
ئـەسـتێران لـە سـەر لووتکـەی بـەوەنـەوز
هــــەور بــــە دەســــیانۆ هاتوونــــە ئامــــان
بۆیــە پێــی دەڵــێن شــاخی هــەورامــان
تــا چــاو کــار دەکــا چۆمــە و دار و کێــو
کتــــێبی عیشــــقن هــــەوراز و نشــــێو
چــــڕە، هــــەورازە، بــــەرزە، زەنــــوێرە
بــە فــووی باڵــی مــەل هــەوا بلــوێرە
کاتــێ دەگــەیتــە شــاری مــەریــوان
بــــەرەو زرێــــوار دەکێشــــێ ئینســــان
وەک ئیکســـیر وایـــە و لا دەبـــا ئـــازار
تیشـــکی ئێـــوارەی خـــۆری زرێـــوار
بـــەتایبـــەت کـــاتی شـــایی و زەمـــاوەن
دڵـــە و دەبێتـــە باخچـــەی بـــێخـــاوەن
هـــەر ســـاتێ دەکشـــێ بـــە شـــکڵ و نـــاوێ
بـــۆ نێـــو باخچـــەی دڵ پـــەپوولـــەی چـــاوێ
ئێـدی هـەر تـۆی و شـیعر و عـەشـق و کـوڵ
هـــەر هـــەورامانـــە و دەریـــا و دار و گـــوڵ
مـەگـەر لێـت تێـکدا وەک خـەوی ڕەویـو
هـــەواڵـــی تاڵـــی ئـــەحواڵـــی ئـــەو دیـــو

دەنـــا ئاڵایـــە لـــە مـــەزرا و قـــۆپی
دەسرەی هـەڵـپەڕکێـی بـووکی سـەرچـۆپی
داوەتـــە، بـــەزمـــە، چـــۆپی کێشـــانە
نـــاز بـــە مسقاڵـــە، هـــەر شـــان بـــە شـــانە
هـــەر شـــان بـــە شـــان و ســـینە ڕاوەشـــان
هاتوونـــە ســـەیـــران خـــەڵـــکی کاکـــەشـــان
لێـــرەدایـــە ژیـــن تـــامی شـــیرینە
بـــۆ ئـــەو مرۆڤـــەی شـــەیـــدای ئـــەوینـــە
خوایـــە گـــەر ســـەیـــری چاوجوانـــان نـــەبـــا
شـــادی دەبـــووە پـــووش بـــەدەم بـــای ســـەبـــا
گـــەر گـــیری غـــەمـــی، زاڵ بـــە بـــە ســـەریـــا
وەرە ســـەیـــرێ کـــە لـــەم قـــەراخ دەریـــا
دەهـــاڕێ ڕیـــا و دەغـــەڵـــە و کـــەڵـــەک
وەک ئاشـــی دەوران گـــەڕی ڕەشـــبەڵـــەک
دەنگـــی مۆســـیقا و ســـەرخۆشـــی و ڕۆژپـــەڕ
شـــاعیر تـــوونی ئـــەکـــا بـــۆ شـــیعرێکی تـــەڕ
منـــیش وەک کـــابرای فولکلـــۆری کـــورد
پـــاش ســـەیـــری دەریـــا و چیـــا و پـــارک و پـــرد
«تـــازەم زانیـــوە مـــەریـــوان دەشـــتە»
ئـــەمـــە کـــەی دەشـــتە عـــەیـــنی بـــەهـــەشـــتە
لـــەو دەشـــتە ڕاســـتەی بـــێ چـــاڵ و بـــەرزی
وەک بـــاز ئـــەچریکـــا حـــەنجـــەرەی «دەرزی»

لە کاخی کۆخا هاوڕێی «بەختیار»
بە جووت وەک «زیرەک» دەیانکوت کەویار
لە دەورەی کۆتەڵ مەلای بێساران
پەنابەر دەبم وەک گەستەی ماران
فیدای ڕۆحت بم دڵ بێنە سەما
من لە حەیبەتا شیعرم پێ نەما
ئەو کراس سەوزەی ڕەگەز هەورامە
تۆ نەبی وەسفی نازانرێ نامە
وەفریام کەوە تینێ بۆ هەڵبەست
زەوقم پیر بووە منی جوانپەرەست
ئەم شیعرەش دەیڵێم ڕۆحی گۆرانە
پێم حاڵی دەکا ئەم هەڵبەستانە
بە شیری شیعری شاخی هەورامان
شاعیر گۆچ دەکرێن بۆ مەسنەوی جوان
چاوی تێر نابێ، وشەی نەبانە
تا تێر نەڕوانێ لەم هەورامانە
ئەستێرەی ژینی نایەتە خەندە
تا نەزانێ ژین بە ئەوین بەندە
بەتایبەت عیشقی جوانی و نیشتمان
هەست دەکرێ لە سەیر شاخی هەورامان
هەورامان دەشتە، هەورامان باخە
هەورامان دارە، هەورامان شاخە

## دەسنویژی شیعر

هـــەورامـــان ئـــاوە، شـــاخەی شـــەتـــاوە
گشـــت گیـــانی دەردە و خـــۆی ڕاوەســـتاوە
هـــەورامـــان «ئاســـۆ»ی ئاسمـــانی شـــیعرە
هـــەورامـــان هـــەوری بـــارانی شـــیعرە

بۆکان- ٧٥/٧/٣

## باغی بەرویێ

یــاران ســێوم دی، یــاران ســێوم دی
شـەمامـەی شـلک، گـوڵ بـە لێـوم دی
هـــەنـــاری بـــاخی دوورەخێـــوم دی
دوو تۆپــەڵ ناســک ســپی مێــوم دی
دو کــۆتری ســپی نــاو هێلانــەم دی
دو کــارگی کــەمــای خڕیلانــەم دی
گڕکـەی سـافوسـۆڵ بـێ پـاوانم دی
تەڵای دەستەگۆش دەسـت لاوانم دی
دو تۆپــەڵ بــەفـری ســەر گژنیـژم دی
جووتــێ کاڵــەبـەی سینەی کیـژم دی
دوو گڵۆڵــە نـەرمـی بـەن تـەنـافم دی
دوو هێندەی مەڕمەڕ قەندی سـافم دی
دوو دووگــی بــەرخــی مڕینۆســم دی
دوو هیلکەی گەورەی وە بێپۆسم دی
دوو تەرزەی سافی نووکی مـەمـم دی
دوو مانگی بەدری دوور لە تـەمـم دی
دوو تووری تەرچک سپی و سافم دی
دوو ماشــەر لۆکــە بــێ غــیلافم دی
جووتێ خاسەکەو لـە سـەر بـەفـرم دی
دوو مشت مراورید شووشە دەفـرم دی

## دەسنویێژی شیعر

دوو سپی کەروێشک گەرمەلانم دی
دوو خرچەی تورتی نێو بێستانم دی
دیتم دوو بەرخی بەبێ شوان و کێشک
لە کۆزی سینە ئەیاندا باوێشک
هەر چاوم پێی کەوت بەڕاگوزاری
حەیا کۆچی کرد لە لام یەکجاری
لاقم بێهێز بوو بۆی گەڕامەوە
تەنها لایەکی کرد بە لامەوە
خوایە لە کردەت هەزار ماشەڵا
من چیم دی لە تۆی یێخەی ئاوەڵا
وای تاساندووم ناچێ لە بیرم
لەمڕۆوە بە تای زولفی ئەسیرم
هەرچەندە خۆ هیچ نایێ لە دەستم
دەنگ ئەداتەوە لە نێو هەڵبەستم
خۆزگەم بەو کەسەی باغەوانیەتی
وەک «ئاسۆ» شێتی شکڵی جوانیەتی

بۆکان- ٧٦/٣/١١

کولــوو کولــوو، بــەفــر ئــەبــاری
چــەن وەڕەز ببــووین لــە شــاری!
لـــــە ماڵـــــێ دانیشـــــتبووم، وەڕەز
وێنــەی جـاو خـۆم دابـوو لـە گـەز
بــەڵــێن بــوو خۆشــم نــەدوێــنم
«وەســـتا عوسمـــان» هاتـــە شـــوێنم
لــەگــەڵ پۆلــێ هــاوڕێی بــەدڵ
خــەمــی شــاریمان نــا ژێــر گــڵ
چۆڵ بـوو لـەبـەر چـاو شـار و بـاغ
بێجگـــە لـــە کانییـــەکـــەی دوراغ
قـــەزای دەرێ لـــە ژوور کـــەوێ
تـــەواو نـــەگـــەیبوونـــە ئـــەوێ
«سەید عەلی» و «سەعید» چوونە دەر
تـا «پـاردەکـان» یـەکیـاندا بـەر
وەســـفی نـــازانرێ تـــا نـــەیـــی
چـــارداخی بـــاوکی بانـــەیـــی
«عەولاش» دیار بوو خاوەن ماڵ بوو
شـــارەزا و بـــەڵـــەد و زاڵ بـــوو
شـــۆفیر بـــوو «کۆلکـــە زێڕینـــە»
دیـــارە چـــەن هێـــدی و ئـــەمینـــە

**دەسنوێژی شیعر**

«عەولا» لە بەر خزیی عەرزی
وەک دەعبای کابرا دەلەرزی
چووینە نێو چارداخێ گەرم
تەختی بە پووش و کا نەرم
لەبەر یەکیان نابوو ملیان
سەعید و گۆرانی و قلیان
خۆ منیش هەر بە ئاهەنگی ئەو
غەم لە نێو دڵما ئەکەن ڕەو
دەچمەوە کاتی منداڵیم
جێژوان و هەواری خاڵیم
یادی یارانی دوور وڵات
وڵاتی پڕ لە کارەسات
دەمکاتەوە خاسەکەوێ
هەر بخوێنم ڕۆژ و شەوێ
بە یادی ئەو شادی و سەما
لەم وڵاتە شوێنی نەما
هەر شیعر و بەستە و زەمزەمەم
لە زار نەبڕێ لە زۆر و کەم
کە بابی کۆلکەزێڕینە
لە بەر ئەو بەفر و بارینە
تامی زێوە و فەقێ دەبڕێ
تۆزێ خەفەت لە دڵ دەسڕێ
«سەید عەلی» و کتری و چاییەکەی

«وەستا عوسمان» و تەهوییەی
من شیعر و «عەوڵاش» گۆرانی
سەعید و سیخ و قلیانی
ئاسمان کرێوە و کێو خامۆش
دەشت و دار و باخ سپیپۆش
بەزمی کەیخوسرەوە لێرە
ساقی فریام کەوە دێرە
ئەم شاخ و کێو و ناو باخە
خەمڕەوێن و شادی ناخە
ئەم شاخ و ڕەوەز و گردە
جێگەی شۆڕەلاوی کوردە
ئەم هەڵدێر و ڕژد و گەوە
جێگەی قاسپەقاسپی کەوە
هەتا ڕاوچی زۆرتر بێنن
ئەمان باشتر دەچریکێنن
ئەم شاخ و کێوە سەربەرزە
لانی شێرەلاوی تەرزە
ئەم بەفر و ساردی و زستانە
هەناسەی ساردی ئەوانە
بۆ وڵاتی چۆڵ و خامۆش
بۆ ژینی ژێردەستی و کڕنۆش
بۆیە من لێرە مەست ئەبم
تێکەڵاوی هەڵبەست ئەبم

**دەسنوێژی شیعر**

چیا ئەوانم بیر دەخا
پەردەی ترسم وەلا دەبا
هەناسە ئاسان دەکێشم
غەم نایێتە دڵی ڕێشم
بەڵێ یارانی هاوڕەنگم
قەت مەزانن من بێدەنگم
جارجار ئاوا یادم دەکەن
خێرتان دەگا شادم دەکەن
قەت لە بیر ناچێ پاردەکان
شیعر، مەستی و بەفر و باران
بیری شادی و خۆشی جاران
چەند کەوتینە یادی یاران
چەندە یادی «عەزیز» کرا
«موجاوریان» هەر دوو برا
هەموومان هاتبووینە ناڵە
بە یادی سەوزەکەی «ساڵە»
یا خوا یاران هەر وا جەم بن!
خێڵی خەم و نەیار کەم بن!
ئیدی «ئاسۆش» وێنەی جاران
شیعر ئەڵێ بە یادی یاران

بۆکان-۱۳۷۷/۱۱/۱۸

بینــەری ئــازیزی کــوردی دڵبــەغــەم
هەڵکە ماهوارەت، سەیر کە جامی جەم
ڕۆحی جەمشید دێ و وەکوو کارتۆن دەڵێ!
ئێــرە تارانــە و مــەکۆگــەی دووکــەڵــێ
دوو کـەڵـی دینـداری گـەورەشمـان هـەیـە
هەر یەکەی لای یەک جەناح بەشمان هەیە
هێنـــدە بـــاریوە بـــە ســـەرمانـــا درۆ
خـۆت لـە نـاو دەریـای درۆی دینـدا بشـۆ
هـەور و هـاژە و هـاتوچـوونی دووکـەڵـە
هــەر چــزووی مــاری شــەقـام و داوەڵــە
بوتکـــەدەی پۆنـــد و دولار و ئانـــەیـــە
قاقــڕی ڕوخســـار و زولـــف و شـــانەیــە
گـــەردەنـــەی بـــازاڕی شارســـتانە گشـــت
بێنـە خـەڵـوار و لـەشـت پڕپـڕ کـە مشـت
ئێـرە دانشـگای بـە قـەت پـاریس هـەیـە
سێ ئـەوەنـدەی وێـی شـەقامی پیس هـەیـە
لێـــرە دانشـــجوو هـــەمـــوو پـــڕ دانشـــن
گشـت لـە شـەتـڕەنجی ئـەویـنداری کشـن
بـەرق و ئـەنتیگـڕاڵ و ئـەسـتێرەی سـوەیـل
پـاکی قوربـانی خـەتـێ دۆعـای کومـەیـل

لێــرە ئوســتادان لــە زۆریــی دەرس و ئــیش
دەســـتیان ناگـــا بـــدەن تیغـــێ لـــە ڕیـــش
ئـــاخرین باســـە و خـــەبـــەرداروو دەکـــەم
گەرچی هێنـدێ هـەسـت بریـنداروو دەکـەم
ئەو کەسـانەی لێـرەوە گـەل کـۆک ئـەکـەن
ئەو هەموو زوڵمە و قسـەی نـاپۆک ئـەکـەن
زاهیـدی ڕۆژ و چـەتـە و جـەردەی شـەوێـن
لانی گورگـە ئێـرە، مـەڕ گـەرمـی شـەوێـن
لێـرە تـا ڕان گـەل لـە نێـو قـوڕدا چـەقـین
ئێـــرە تـــاران! مـــەرکـــەزی ئێـــرانزەمـــین
حــەیفــە ئــەم شــارە بــە پێتــەخــتی بکــەی
هــەر دەبــێ ئێـرە بـە پـێ، تـەخـتی بکـەی!

تاران ـ ٧٧/١٢/٢٤

## شینی قەڵەم

کاتێ هاواری قەڵەم دێتە خرۆش
کەڕ دەبێ سۆزی خەیاڵی سەرخۆش
کاتێ مۆسیقە لە زەربی دەکەوێ
پێکەنین بێکەسە هەر چاو دەیەوێ
ئەو دەمەی تۆز و تەمی کۆچی هەواڵ
دێ و دەڕێژێ بە کزی چاوی خەیاڵ
ئەو دەمەی تاوە کەسیرەی دەکەوێ
نایەوێ مژ لە وڵاتێ بڕەوێ
ئەو دەمەی زوقم و زرووقەی سیخوار
دێتە جێی ورشەیی دەسماڵی بەهار
ئەو دەمەی خەم بە خەیاڵ پێدەکەنێ
ساردەبا بسکی وتەم ڕادەژەنێ
لێو بەجێ دێڵێ قسەی خۆش و بەتام
ئەو دەمەی ڕادەچەمێ بەژنی نەمام
هێڵی کاغەز وەکوو گۆڕی سڕ و سارد
لەت دەکا جەرگی وشە هەروەکوو کارد
قەڵەمە هێستێ لە گەڕ نابێ وەڕەز
دێتە ناڵین وەکوو شالووری قەفەز

***

**دەسنوێژی شیعر**

قـەڵـەم ئـاخر چییـە، تـۆ بـۆ بـەخـەمـی؟
کاغەزت نووکی چەقـۆش بـێ قـەڵـەمـی
زاری تـــۆ ئـــاوی حـــەیـــاتی تێـــدا
ژار کــە هــیچ، نــوقڵ و نــەبــاتی تێــدا
وەرە شـــەکـــراوێ بـــە زارتدا بـــێ
ســـاردە بـــەفـــراوێ بـــە زارتدا بـــێ
تۆ سپی ڕەش کـەوە ئـەممـا نـە بـە شـین
«سەوز» و «ئاوی» بە وەکوو خەونی ئەوین
ئەو دەمـەی هـەستی بە سۆزی مـەستی
بــە هــەناســەم لــە گــەرووودا بــەســتی
وەرە تـۆ بـۆم ببـە مـەی، بـۆم ببـە نـەی
قەڵەم هەر تیژ بە، نەچی کۆڵ بی، نەکەی

***

قـەڵـەم ئـاخر چییـە تـۆ بـۆ بـەخـەمـی؟
کاغەزت نووکی چەقـۆش بـێ قـەڵـەمـی
کەچـی دڵ پـێم دەڵـێ تـۆ بـۆ بـەخـەمـی
نـەفـەست ساردە، چیـای سـەربـەتـەمـی
بۆیــە تــۆ ڕەنگــی وشــەت هــەر شــینە
چـاوی شـین جوانـە، حـەقیقـەتبینـە
حـــەقتـــە بـــەم حاڵـــە بـــبی نـــاڕازی
چونکـە جێمـاوی لـە پـەنجـەی قـازی
پەنجە کام پەنجە؟ ئـەوەی پـەنجا سـاڵ
نووسی و هۆندی هـەتـاکوو کـوڕ و کـاڵ

## محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)

ئـــاڵ و گـــۆڕێکی بکـــەن ئـــەندێشـــە
تـــاوەکـــوو شـــێر نـــەبـــڕێ لـــەم بێشـــە
بۆیـــە چـــاوت بـــە نم و ئـــەســـرینە
چـــاوی تـــەڕ کـــانی دڵـــی خوێنینـــە
دیـــارە تـــا خـــەم تـــەلی تـــارت بـــژەنـــێ
مـــەینـــەتی تـــانی خـــەیاڵـــت دەتـــەنـــێ
هەر کە تەم لەرزی لە پـەنجـەت بگـەڕێ
ئیـدی قـەت بـەردی خـەمـت نایـەتـەڕێ
چـــاوەکـــەم ژانـــە نیشـــانەی بوونـــە
هـیچ پـەرۆشـیت نـەبـێ «ئاسـۆ» ڕوونـە

بۆکان- ٧٦/١٠/٢٨

## لە کۆنگرەی ئەرکەوازی ئیلام

زۆر لــەمێــژە ئــەوەم مــەیلــە
ئـــاواتی دەروونی کـــەیلـــە
بــە باڵــی شــەوقــم هــەڵــفڕم
سینگی ڕەشــی شــەو هــەڵــدڕم
غــەم بخـــەمـــە ئامـــانئامـــان
وەک شـاخەکـانی هـەورامـان
بـــاران بـــە ســـەرمـــا ببـــارێ
وێنەی تەیری کۆچەر جارێ
بنیشـــمەوە ســـەر دالاهـــووم
باڵــم لــە هــەتــاو هــەڵبســووم
زێــدی کــۆنی کــورد ببیــنم
بـــاغ و چـــۆم و پـــرد ببیـــنم
ئـــیلام و هـــەرســـین ببیـــنم
شــەدە و کــەمــەرچــین ببیــنم
بێمـــە زێـــدی ئـــەرکـــەوازی
ئـەو پـیرەی دەنـگ و ئـاوازی
لــە مێــژوو دەنــگ ئــەداتــەوە
ژەنگـــی مێـــژوو ئـــەشـــواتەوە
وێنــەی شمشاڵــی پــیرەشــوان
دێتـــە ناڵـــەشـــکێنەی بۆکـــان

مــــن دەخاتــــە ســــەرشاباڵــــی
بە گەرووی چەشنی شمشاڵــی
فێــرم دەکــا چــۆن بخــوێنم
تاسەی مێژووی کـۆن بشـکێنم
بە فـووی شـیعری موکوریـانی
لابــــەم تــــەوژمــــی زریــــانی
ئەو با تووشـەی سـەرمـا دێنـێ
مـەل دەنێـرێ بـۆ گـەرمێنـێ

***

زۆر لــــەمێــــژە بــــەو ئاواتــــەم
لاچـێ لـە سـەر شـیعرم ماتـەم
پــەپوولــەی ئــاوات و هیــوام
بێتــە ئــاو گوڵــزاری ئــیلام
لە ناو باخچەی شیعری گـۆران
هــەڵاڵــە بچنــێ بــۆ ســۆران
پــەیــامی دار بــەڕووی بانــە
بێــــنم بــــۆ ئــــەم دارســــتانە
بڵێم هەر دوو لە یەک ڕیشەین
بـرا و هاوڕیشـەی هـەمیشـەین

هەر دوو گـۆچ کـراوین کاکـە
بـە ئـاوی کـانی ئـەم خاکـە

## دەسنوێژی شیعر

ئۆخـەی ئـاواتم بـەدی هـات
کەوتمە نـاو گوڵـزاری ئـاوات
داڵاهـووم دی بـە سـەربـەرزی
زەوی لـــەبـــەری دەلـــەرزی
سەربەرز چلـۆن دەبـێ نـەوی؟
وەک شـیعرەکـانی مـەولـەوی
ئەوشـەو دیـتم دو ئـاوی ڕوون
لە شـاری ئـیلام تێکـەڵ بـوون
شیعری موکری و ئەرکـەوازی
دایکـــــی نیشــــتمانیش ڕازی
دەیکوت بە ئـاوازێکی خـۆش
دار و بـــەردی دەهێنـــا جـــۆش
شیری مـەمکـم حـەڵاڵـتان بـێ
ئاسمان «ئاسۆ»ی خەیاڵتان بـێ

ئیلام ـ ٧٣/٦/٢٣

## مەرسییە «؟»

ئـــەی ئـــەوەی هێـــزی خـــەیـــاڵاتی مـــنی!
ساڵـــــە وەختێکـــــە لـــــەبـــــەر چـــــاوم ونی!
ساڵـــــە وەختێکـــــە بـــــە ئـــــاواتم شـــــەوێ
سۆزی دەنگت شەو لە پەردەی گوێم کەوێ
ساڵـــــە وەختێکـــــە دڵـــــم لانـــــەی خـــــەمـــــە
چـاوەڕێتـە و داخـەکـەم جێـی تـۆی کـەمـە
ئـــەی چ بـــوو، بـــۆ بـــۆ دەمێکـــیش نایـــەوە؟
ئـــەی شـــەمـــی ڕوونی دڵـــم بـــۆ توایـــەوە؟
خــۆ ئــەتــۆ جێگــەت لــە نێــو دڵــمایە هــەر
شــێوەکــەت تێکــەڵ بــە خوێنــە و نایــە دەر
ڕاســتە بــە ڕواڵــەت لــە کۆشــکی مێــژووای
یـــا بـــە قـــەولـــێ دیکـــە میـــوانی خـــوای
گـوێم دەیـە تـۆ ئـەی لـە مێـژوو گـەورەتـر
ئـەی شـەپـۆلی بـەحـری تـووڕەی قـەت نـەمـر
وەک پـــەپوولـــەی دەوری شـــەم دەتوێیـــەوە
ئـــــەو دەمـــــەی دەتوێیـــــەوە دەژێییـــــەوە
خـەونی سـووکی و سـرتەیـەک هـەڵـناگری
ڕۆحـــی بـــارانی و لـــە هـــەورای، نـــامری
پێکـــەنـــینی چاوکـــەژاڵـــی چـــاوەڕێـــی
گـوێی ئـەویندارت کپـیش بـێ دێتـە گـوێی

وەک خـــورەی کانیـــاوی ڕوونی دەم نـــزار
قوولْـــتره مانـــات لـــە گـــۆمی بـــێبـــوار
تـــۆ شـــنەی کوێســـتانی بـــەرزی بـــێنـــەشـــەی
بـــۆ گوڵـــی سـیس و پـــڕووکاو وەک گـــەشـــەی
تـــۆ ئـــەویـــنی، تـــۆ دنـــەی، وەک تـــین دەچـــی
وەک شـــنەی شـــەوبـــای دەمـــەو هـــاوین دەچـــی
هـــەســـتی عـــەشـــقت پـــێ دەگرســـێ نـــاو بـــە نـــاو
خـــوێنی عـــەشـــقی میللـــەتی و نابیتـــە ئـــاو
چـــەنـــدە تامـــەزرۆی تـــەماشـــایێ تـــرم
مـــن پـــەپوولـــەم، عاشـــقی نێـــو ئـــاگرم
مشـــتەرییـــی ئاڵـــەتیـــت وەک مـــن کـــەمـــن
کوانـــێ مێـــژوو تـــۆ دەناســـێ وەک ئـــەمـــن
وا وەرە ئـــەی تـــۆ لـــە مێـــژوو گـــەورەتـــر!
ئـەی نیگـات هـەر عـەیـنی چـەخماخـەی هـەور!

***

ئـــەوکـــەســـەی عاشـــق نـــەبـــێ بـــێهۆیـــە گـــەر
نـــاوی تـــۆ جـــارێ بهێنـــێ بـــێســـەمـــەر
هـــەر کـــەســـێ بـــێعـــەشـــقی ڕاســـتی ڕێ کـــەوێ
چـــاڵ و ڕێ ناناســـێ حـــەتمـــەن تـــێکـــەوێ
هـــەر کـــەســـێ عاشـــق نـــەبـــێ ســـادق نییـــە
تـــۆ خـــودا ژیـــن بـــێ ئـــەویـــن مانـــای چییـــە؟
کـــێ لـــە نێـــو گوڵـــدا غـــەریـــبی هـــەســـت ئـــەکـــا؟
کـــوا دڕوو بولبـــول بـــەحاڵـــیش مـــەســـت ئـــەکـــا؟

تــۆ گولــێ بــووی بــێبــەهانــە و بــێ گــڕوو
چقڵـــی چـــاوی ناکـــەس و خێڵـــی دڕوو
ئـــەم وڵاتـــەت عاشـــقانە خـــۆش ئـــەویســـت
گوێچکـە دەنگـی تـیری تانـەی هـەر نـەبیسـت
بۆیـــە تـــا ســـرتەی ئـــەوینـــدارێکی پـــاک
ئـــاوەدان کـــا قـــوژبن و ئـــامێزی خـــاک
یـــادی تـــۆش هـــەر وا لـــە دڵـــدا باقییـــە
نـــاوەکـــەت بـــۆ بـــادەخـــۆران ســـاقییە

***

ســـەردەمێکـــە ژەنگـــی مێـــژوو دەیهـــەوێ
نـــاوی زێـــڕت ڕەش بکـــا لێـــرە و لـــەوێ
ســـەردەمێکـــە شـــەوپـــەرەســـتانی زەلیـــل
ون دەکـــەن نـــاوت لـــە مێـــژوو بـــێدەلیـــل
ســـاردەبـــا ڕۆچنـــەی لـــە جێـــژوان نایـــەوە
قـەل لـە جێـی قـومری سـەری هـەڵـدایەوە
ســـەردەمێکـــە داوەتـــان بـــێ شـــەوگـــەڕن
باڵـی سـۆنەی گـوێی شـەتـاو بـە خـۆین تـەڕن
ســـەردەمێکـــە بـــای «ســـەبـــا» زیندانییـــە
شـــەختـــە کۆکـــە و هێـــرش و جـــەولانییـــە
ســـەردەمێکـــە عاشـــقن ســـووک و چـــرووک
مـەل بـە قوفڵـی داوەیـە بـە مـل و دەنـووک

کـــەوتـــە ســـەر گوفتـــاری حـــەق تـــویژی درۆ
چـاوەکـان بـە درۆ لـەگـەڵ یـەک دێنـە گـۆ
بـــای ســـەداقـــەت لـــەم ولاتـــە کـــەوتـــووە
پـــیرە شـــەنیـــاری حـــەقیقـــەت خـــەوتـــووە
لاوەکـــان گشـــت چوونـــە دروێنـــەی ئـــەڵـــەم
داوەتـــە، بـــەزمـــە لـــە جـــێ خـــەرمـــانی خـــەم
وا جـــەزەی ســـوور کـــردووە فرمێســـک و شـــین
نـــان و تووشـــی بـــۆ نـــەمـــاوە پێکـــەنـــین
هـــەرچـــی خـــەڵـــف و داره تـــوونین بـــۆ شـــەواو
گوێچکـــە پـــاکی شـــل بـــووە بـــۆ چـــاو و ڕاو
دەفـــری دەخڵـــی گـــەل فریـــوە، تـــەفـــرەیـــە
چـــاوی ئـــاواتیش هـــەمـــووی لـــەم دەفـــرەیـــە
لاوەکـــان زۆریـــان لـــە دووکـــەڵـــدا ونـــن
شـــێری مـــاڵ و ڕێـــوی هـــەردی دوژمـــنن
کـــوا لـــە کـــوێی ئێســـتا ببـــینی چـــەن بـــەکـــوڵ
عـــارەقـــی شـــیعرم دەنۆشـــم پـــڕ بـــە دڵ؟
کـــوا ســـوراحی؟ میســـرەعـــیش مـــەســـتم دەکـــەن!
دێم بـــەرەو بـــەرزی بچـــم پـــەســـتم دەکـــەن

***

گـــوێ لـــە دەردم ڕاگـــرە بـــەردی ســـەبـــوور
چـــۆن نـــەچـــڕژێ ماڵـــی هـــەســـتم وەک بلـــوور
کۆشـــکی تـــەنیـــاییم فـــەقـــەت ئـــەژنۆکـــەمـــە
چـــەن لـــەوێـــدا شـــین بکـــەم بـــۆ تـــۆ کـــەمـــە

ماڵــی ئــاوا بــێ لــەوێــش فرمێســکی چــاو
وا بــەخــورڕ دێ هــیچ نییــە حــەوجــێم بــە ئــاو
نــان و ئــاوی ئــەم گــەلــە شــینخواردنــە
تێگــەیــین و تــرس و خــۆ لــێ بواردنــە
بووینــە گــورزی ســەدهــەزار فــێڵ و فــەرەج
ئــەنقــەرە و تــاران و بــەغــداد و کــەرەج
گشــت ئــەمانــە پــڕ لــە هــاواری مــەیــە
جــامی ئــاواتی گــەلــیش هــەر بــێمــەیــە
هــەر وشــەی مــافی بــوێ قاچاخــە هــەر
نــەجمــەیــی ســەرشــانی حــەقخــواز داخــە هــەر
هەر ئـەوان تێـر و ئـەمـەش هـەر چاو لـە دەست
بوونە بوت بۆمان، ئـەمـەش وەک بـوتپـەرەست
شــیعری دڵــداری کــز و ئــازوردەیــە
بــاری مــەینــەت حــەقــدەســی ئــەم کــوردەیــە
هــەر ئــەمــەیــن ســووتاو و ڕەنجکــێش و هــەژار
دەسبــرین و کۆنــەپــۆش و کۆڵــەوار
ڕەنجــی شــان و پیلــی ئێمــەش بــۆ ئــەوان
تــاوەکــوو دانی هــەبــێ قــەت ئاشــەوان
ئــاشبــەتــاڵ ناکــا مــەگــەر خــوا گێــژی کــرد
هــەر دەهــاڕێ گــەنم و جــۆ و داهــاتی کــورد
کاکی کوردیش چـی؟ هـەمووممـان دژ بـە یـەک!
تاقمــێ ســوور و بــڕێ ڕەش یــان بــەڵــەک

بــۆ مــەنــافیع بــاب و فــرزەنــدیان نــەهێشــت
کــەس نمــەک ناناســێ هێنــدەی تامــە چێشــت
چـــارەنووســـی میللـــەتـــیش بـــێ ناونیشـــان
خـــۆ نـــەمـــاوی تـــا بـــدەی ڕێمـــان پیشـــان
دەنگـــی شـــێرانەت بڵـــێ توخـــوا مـــەکـــەن
هــەتڵــەیــە ئــەم ڕێگــە توخــوا مــەکــەن!
هێنــد لــە فیکــری خــۆ مــەبــن ئــەی نیشــتمان
حــەیفــە بفرۆشــرێ ئــەویــن بــۆ ئــاو و نــان!

***

زۆر لـــەمێـــژە دەمهـــەوێ زۆر شـــت بڵـــێم
کـــەس نییـــە گـــوێ ڕاگـــرێ دەردی دڵـــێم
کـــــەس نییـــــە هـــــاوار و ناڵـــــەم بژنـــــەوێ
بوومـــەتـــە دەرد و پـــەتـــا، کـــەس نامیـــەوێ
دەچمــە لای هــەر کــەس دەڵــێی مۆتــەی غــەمــم
ئــەو لــە مــن چــەپڵــەی دەوێ و مــن ماتــەمــم
ئــەو بــەڵــێی ســەر زارەکــی و مــەدحــی دەوێ
ئــەو تــەمــی کــەللەی بــە هــەڵــبەســت نــاڕەوێ
ئـــــەو دەڵـــــێ مـــــن ببمـــــە ئاوێنـــــەی ڕیـــــا
جــا لــە بــەرمــا خــۆی ببینــێ جــوان تیــا
ئــەو بــە جــارێ دەیهــەوێ خــۆی ســەرکــەوێ
چـــش مـــنی پێشـــێل دەکـــا مۆتـــەی شـــەوێ
چوومــە لای هــەر کــەس بــە عــەزمــی هــاوەڵــی
بـــۆم دەخوێنـــێ ئایـــەتی گـــوێڕایـــەڵـــی

کەس نەبوو پەردەی دڵم هەڵداتەوە
کەس نەبوو شووشەی دڵم بشواتەوە
کەس نەبوو کڕیاری هاواری دڵم
کەس وەکوو تۆ گوێی نەدا هەست و کوڵم
هیچکەسێ فرمێسکی چاوم ناسڕێ
گەوهەری فرمێسکی من کەس نایکڕێ
گەوهەری فرمێسکی من شینی گەلە
سەد وەکوو نووحیش دەخاتە پا مەلە
گۆمی شینی شیعری من تووکلێکراو
دێتە لرفە هەر وەکوو ئاوی شەتاو
چونکە هاواری وشەی شیعرم تەڕن
گوێی گەلی ویشک و برینگی لێ کەڕن
شیعری من سەرپاکی ئایاتی دڵە
هەڵگری سرتەی حیکایاتی دڵە
ئایەتی دڵ گوێگری پاکی دەوێ
شەرح و تەفسیری مەلای چاکی دەوێ
شەرحی دەردی دڵ کتێبێ گەورەیە
خۆی بە تەنیا چەندە سیکل و دەورەیە
بۆیە خۆم پێ تاک و فەرد و بێکەسە
عاشقم بەو دەرس و دەورە و مەدرەسە
عاشقی شەرحی ئەوینم بێدرۆ
کوانێ هەستم مەست ئەکا گریان و ڕۆ؟

گــەر دەڵــێم مــن مــەرسـییەی تــۆ؛ وا نییــە
مــن خــراپ بم، کــەس وەکــوو تــۆ چــا نییــە!

***

ئـەو خـەمـەی تـۆ هێنـد خـەمـیٚ سادەش نییـە
کـــاری شـــیعر و شـــیوەن و بـــادەش نییـــە
شـیعری ئێسـتا هـەسـت و ئـۆخژنی کـەمـە
دوور دەهـــەنگێوێـــت و قرمـــژنی کـــەمـــە
شـیعری ئێسـتا سـووکە بـۆ قورسـی خـەمـت
تـــەســـکە بـــۆ داوێـــنی بـــەژنی ماتـــەمـــت
کێشـەکـەی کێشـەی لـە دوون بـۆ نوانـدنی
سـووکییە هـۆی نـەقـد و هـەڵسـەنگانـدنی
شـــیعر ئێســـتا بـــەحـــریٚ پانـــە و بـــیٚســـنوور
بـیٚشـەپـۆل و سـەوز و گـەش چـەشـنی بلـوور
تیشک و دەنگۆی چاو کە هیچ، گویٚ کەڕ دەکـا
دەچییـــە نـــاوی تـــا قولاپـــەت تـــەڕ دەکـــا
کوانـــیٚ ئـــەو شـــیعرانە وا مووچـــڕکی بـــوو؟
بـۆ سیاسـەت جـار و بـار چنگـوڕکی بـوو؟
هـەر بـە یـەک بـەیتـیٚ وەکـوو پۆلـوو و سـکڵ
مـەنجـەڵـی دڵ پێـی دەهاتـە جـۆش و کـوڵ
کـۆن بـووە هـەرچـی خـدەی پیاوانـەیـە
وەک غـەرب بـوون قیبلـەی ئـەم لاوانـەیـە
غـەرب ئـەگـەر تـەکنیکـی بـیٚئـەژمـارە هـەر!
شـــیعری بـــیٚتامیشـــی نوقڵـــی زارە هـــەر!

ئێوە زانست و عیلم فێر بن لەوان
شیعر و موزیکیان زەعیفە و ناتەوان
خۆ نەماوی تا بە پێنووسی پتەو
هەر لە ڕۆژاواوە دەنگیان دەی لە خەو
چاوی خۆت بۆ لاو بکەیتە پەنجەرە
جا بڵێی کاکە ئەمە گشت سێبەرە
مەبنە جۆلا، سەردڕی خۆتان نەوێ
هەر گەلێ بۆ خۆی نەوێ سەر ناکەوێ!

***

جاروبار دێم داخی مەرگت بەرمە کێو
تۆزێ بۆت بگریم لە بن یەک دارە سێو
داخەکەم لەم وەرزەدا کێڵگە و بەیار
وشکە دێمێکن تەنانەت تاقەدار
دارە توو چەتری سەری کونکون بووە
شۆڕەبی دەرزی قژی لێ ون بووە
تاقەداری سەرمەزاران بوون بە کۆڕ
پاکی پاراون بە فرمێسکی شەپۆڕ
کۆڕی بن باغ و چنارستان غەمین
دەنکە فرمێسکە بە جێگەی پێکەنین
ناوەرۆکی شیعری گۆرانیش کزە
زامی ئاهەنگێ کەمێ خۆش ئاودزە
هاتوچۆ و پرسین و شۆخی و گەنجەفە

جێی لە گۆشەی سەر شەقام و نێو سەفە
سەردەمی شادی و چەپی بوونە چەمەر
هەستی ئازادی نەما حەتتا لە دەر
هەرچی خاوەن ماڵە ژێردەستە و غەریب
ئەجنەبی و خوێڕی لە یەک دریان تەریب
کەسپ و شوغڵی سەردەمیش قاچاخییە
بێسەوادی باو و خوێندن یاخییە
سەدهەزار خۆزگەم بە خۆت وا بووت نەجات
لەو خەمی ژینەی گەلی بێدەستەڵات
داخی ئەم خەمخواردنە زاناکوژە
هەلپەرەستیش داری دەستی خوێنمژە
پشت و ڕوو و ڕاست و چەپ و خوار و سەروو
هەڵدەلووشن مافی ژێردەست وەک زەروو
باب و ڕۆڵەش وا لە یەک بوون بێخەبەر!
ڕوحمی دایک و بابەکەش نەیما ئەسەر!
کێ دەوێرێ هەر بە سرتەش بێژێ لەل؟
باسی بزنە و نانەکەی شوانە و ئەجەل

***

من هەمیشە پێش ئەوەی بێم یان بڕۆم
ترسی ماڵاواییە کەند و کڵۆم
چەندە سەختە یەک بەجێ هێشتن لە ژین
جا کەمێکیشی هەبێ تامی ئەوین
گەر نەبێ هیوایێ دیکە بۆ هەناو

ئیـــزنی ڕۆیـــین کـــوا ئـــەدا بـــارانی چـــاو؟
چـــاو بـــە یـــادی دیتنـــێ دی ســـۆی هـــەیـــە
لاق بــــە هیـــوای هاتنـــێ دی ڕۆی هـــەیـــە
چەن "بە خێر بـێ"م خـۆش دەوێ بـۆ سـڵاوەکـەم
هێنـــد لـــە ســـەر چـــاوم دەترســـێم چـــاوەکـــەم
گـــەر نـــەبـــا هیـــوای تررووســـکەی چـــاوی ڕەش
پاشـــی تـــۆ هـــەر گۆشـــەگـــیریم دەبـــووە بـــەش
مـــن هـــەتـــا ڕۆحـــی عـــەشـــق مابـــێ دەژیم
بۆ ئەوین یـەکڕەنـگ و یـەکڕوو وەک ڕەژیم
تـــا بـــزەی پشـــکووتنی گـــوڵ هـــەر هـــەیـــە
نـــاوەرۆکـــی شـــیعری ئـــەمنـــیش تـــازەیـــە
بۆیـــــە پێـــــوەم بێنمـــــە کۆتـــــایی قســـــەم
بـــــۆنی هیـــــوای پێـــــوەیـــــە دوایـــــی قســـــەم
بۆیـــە شـــینی تـــۆم لـــە لا کـــەســـری نییـــە
خۆشـــەویســـتی ســـەردەم و عـــەســـری نییـــە
تـــا دڵـــی «ئاســـۆ»یـــە بێشـــکەی شـــینی تـــۆ
هـــەر گوڵـــی لالـــەن یـــەقـــین پـــەرژینـــی تـــۆ

بۆکان- ٧٧/٥/٧

# تۆزی خەمێ

تــۆزی خــەمــێ لــەم گــەلــە هــەڵنیشــتووە
چاوی خـەم و دەردی بـە جـووت ڕشـتووە
شـاعیر و نووسـەر هـەمـوو چـاو پـڕ نـەمـن
عــارف و عــامی هــەمــوو دڵ پــڕ خــەمــن
دەشــت و دەمـەن هاتوونـە گریـان هـەمـوو
ورد و درشــت خـاکی موکوریـان هـەمـوو
بــۆ چییــە وا خــەنــدە لــە لێــو مــردووە؟
دەسـتی ئـەجـەل کێهـە کـەسـی بـردووە؟
ئــەو دڵــی ئاواتــە کــە قــەت نــەســرەوت
بـەو هـەمـوو ئیحساسـە لـە لێـدان کـەوت؟
دەک نەفـەسـو تاسـێ بـە تاسـەم، ئـەجـەل!
بێتــە ملــت دەیــنی هــەناســەم، ئــەجــەل!
خــۆ ئــەوە «کامیــل»ە لــەمــەت ســاندەوە
نــەزم و نیزامــی کــەلیمــە هــەر بــەوە
نایـەتـە سـەر زاری شـیعر یـەک نـەفـەس
چەشنی بزەی لێوی هەمـوو قـەوم و کـەس
مـن چ بڵـێم ئێسـتە لـە شـەرحـی فـیراق؟
لاڵــە زمــانی قــەڵــەمــی ئیشــتیاق
من لە خەمت چۆن بـە دوو چـاوم چـەمـێ
چـاری دەکـا سـۆزی دەروونم کـەمـێ؟
شــاهمی، ئــاواتمی، شــەمســی مــنی

## محەمەد سەعید نەجاری (ئاسۆ)

تازە بە یەکجاری لە ئاسۆ ونی
جا مەگە من بمە گەدای مەولەوی
تێکەڵی نەی کەم گڕی شیعرێ لەوی
«جان جهان دوش کجا بودەای؟
نی غلطم در دل ما بودەای»
مدفن تو تک‌تک دل‌های ماست
کی تو بمردی کە نمردن تراست
کوا دەمرێ ئەو کەسە بۆ گەل ژیا؟
دەستی ئەجەل با لە گەلی کا جیا
من غەمی تۆ کاکە بە چی دەربڕم؟
هێندە لە بەر کۆچی ئەتۆ دڵپڕم
هەروەکوو «زەنبیل»ی ئەتۆ ماڵی دڵ
تێک‌چووە، ڕووخاوە؛ کەچی دێتە کوڵ
هێند لە کوڵە وەک دڵی «جەعفەر» لە بۆت
گوێ گرە «ئاسۆ»کەتە شاگردی خۆت
دیدەنی دیداری مە ڕۆژی حەشر
شاد بێ ڕۆحت، شاعری پیری نەمر!

زەنبیل ـ ١٣٦٨/٦/٥

## خەمێ ڕەنگین

خەمێ سوور نیشتەوە سەر کۆڵی شیعرم
دەگووشێ بۆ شەڕابی بۆڵی شیعرم
خەمێکی سەوزە دەیناسم لەمێژە
وە گریانم دەخا و بۆ خۆی نەوێژە
دەڵێی دەردی ئەوینێکی خەمینە
دەمێ سەوزە، دەمێ سوور، جارێ شینە
کە دەگری هەوری نیسان لێی دەترسێ
هەوێنی شیعری عەشقە و پێی دەگرسێ
دڵۆپی شەونمی چاوی وەکوو دوڕ
بە ڕیز دەتکێ و دەبێتە چۆمەڵێ خوڕ
بزەی گەر دێتە سەر لێوانی تینوو
لە ودمی شاخەکانیش دەبنە مینوو
دەڵێی دەردی هەڵەبچەی شارەزوورە
کە هەر ناسۆرە ئەم نیزیکی دوورە
خەمی من چون خەمی ڕەنگین کەوانە
کە ڕاستە و هەر ئەوینی نیشتمانە
بە خێر بێی ئەی هەتاوی خۆشەویستی!
لە تۆڕا بەرزە ناوی خۆشەویستی
بە خێر بێی ئەی خەمی ڕەنگ ئەرخەوانی!
هەموو ڕەنگی؛ بەڵام کوا تۆ لەوانی؟

لـه بـۆ نـەخـش و نیگـارت کامـه نـەققـاش
ئەتۆی کێشاوە ئەو جۆرەی کە هەی بـاش؟
نـەخێـر تـۆ نـووری، نـاگونجێی لـه گـڵدا
دەبـێ بکشـێی لـه نێـو ئیحسـاس و دڵـدا
بـەڵـێ تـۆ نـووری دەردێکـی بـەڕێـزی
ئـەویـنی نیشـتمانی زۆر بـەهێـزی
دەلیلـی ڕێـی، لـه شـەوگـارا هـەتـاوی
لـه ئاسمانـدا هـەتـاوی نێـو هـەنـاوی
بقونجـێ چـاو لـه نێـو دڵـدا وەدی دێـی
لـه دڵ دەرناچـێ ئـاخر تـۆ خـەمـی کێـی؟
ئـەرێ کـێ بـێ گرفتـارت نـەبووبـێ
بـه پـێخواسـی بـەرەو شـارت نـەچووبـێ؟
لـه تـاوت خـەو لـه چـاوی شـەو نـەتـارا
چ تـاڵ و خۆشـی وەک بـادەی گـەوارا

***

به خێر بێـی ئـەی هـەتـاوی خۆشـەویستی!
لـه تـۆڕا بـەرزە نـاوی خۆشـەویستی
بەڵـێ تـۆی دایـەنی ئـەم هـەسـت و شـۆرە
ئـەگـەر حـەوڕەنگـە، زەردە، شـینە، بـۆرە
دە هـەسـتە بـۆم ببـە فـووی پـاکی عیسـا
بکێشـە سـەر بـە لاشـی ڕۆحـی پیسـا

وەرە زینـــدوو کـــەوە ئـــەم بـــێدڵانـــە
دڵـــی گشـــت ئـــەم چـــەتانـــە، ئـــەم مڵانـــە
وەکوو زاروو کە بە خـوێن هـەڵـدەماسـێن
لـــە باســـی عیشـــق و دڵـــداری دەتاســـێن
نـە حاڵـی بـوونی بلـوێری گـەرووی کـەو
نـــە هـــەســتی بـــۆنی ژاراوی بـــزەی شـــەو
نـــە ئاهـــێ بـــۆ هـــەناســـەی دەردەداران
نـــە هـــاوارێ لـــە بـــۆ حاڵـــی هـــەژاران
بڵـێ بـێن بنـە باڵـی یـەک هـەتـا هـەیـن
لەمێـژە هـاودەمـی ئـەو ئـەشـک و ئاهـەیـن
بڵـێ بـا بـەس بـێ ئیـدی جامـە لووسـکێ
بڵـێ کـەم ئـەم بـە ئـەودا هـەڵبڕووسـکێ
بڵـــێ بـــا بنـــە یـــار و یـــاوەری یـــەک
ئەوین ڕێ بێ، ئەوین پێ بێ، ئەوین چەک
ئـەویـن هـۆی گـەرمـی ئاهـەنگـی دڵانـە
ئـەویـن هـۆی شـەرمـی ئـاونگی گوڵانـە
ئـەویـن بـۆ وەی دەبـێ هـاواری بـەرمـێ
ئـــەمـــن ناڵـــێم ئـــەوا هـــێمن دەفـــەرمـــێ:
«ئەوین نـەبوایـە پێـی نـاوێ بخـۆی سـوێند
جیهان چۆڵ بوو پەپووش تێیدا نەدەخوێند»
ئـــەوینـــێ بـــێ لـــە دڵڕابـــێ نـــە ڕەنگـــی
کـــە عاشـــق بێتـــە ســـەر هیـــوا بـــە دەنگـــی

لـە خـەو ڕاکـا ئـەوانـەی دووره هـەسـتن
دژی یـەکبـوونی خـەڵـکی ڕادەوەسـتن
لـە دەوری سـووره گـوڵ بێتـە پـەپوولـە
دڵان لێـک باخـەبـەر کـا بـێ‌پسـووله
وەکـوو جـێ پێـی بـەڵـەد ڕێبـواری زانـا
لـە ڕێبـەنـدانی بـەفـراوی و گرانـا
شنەی وەک فێنکی شـەوبا بـێ لـە هـاوین
وەسیلەی ڕێی دروست بێت و خودا و دین
ببێتـە دەنگـی هـاواری ئـەوینـدار
بـە گـوێی گوڵـدا بچرپێنـێ هـەزار جـار
بڵێ با دەستی یـەک بگـرین هـەتـا هـەیـن
لەمێـژه هـاودەمـی ئـەم ئـەشـک و ئاهـەیـن
بە یەک بوون و کوڵوکۆی خۆشـەویستی
دەگـەینـە نـووکی «ئاسـۆ»ی خۆشـەویستی

بەهاری ٧٣

## دوو بەیتی

قەسەم بەو جازیبەی بێشێوەکەی تۆ
بە تیشکی چاوە دڵئەنگێوەکەی تۆ
خەیاڵ هەرچەندە ناسک بێت و تەڕ بێ
ئەبەد ناگاتە ڕادەی لێوەکەی تۆ

***

دەڵێن فرمێسک و شین دەرمانە بۆ خەم
گڕی کوورەی دەروونی پێ دەبێ کەم
ئەمن سۆزی هەناسەم ئاگرێکە
ئەسەر ناکا لە تینی ئاوی دوو چەم

***

وەکوو باڵی پەپوولەی دەمبەیانم
هەموو بۆنی گڕن باسی بەیانم
ئەگەر وا بێبزە و زەردهەڵگەڕاوم
«بەهێ» نیم خۆرەتاوی دەرد و ژانم

***

کزی شەوگاری ڕێبەندان و تۆفیم
خەم و دەردی ژیان وای هەڵگوڵۆفیم
بەپێی عومر و تەمەن هەر لاوم ئەمما
بە دیمەن شیشە عەکسی ویشکەسۆفیم

***

بە مەرگت پێم بفەرمووی چۆنە حاڵت
دڵم پێی شادە وەک وەسڵی مەحاڵت
خەیاڵت بوو چەلێکی لێم بپرسی
وەرە! «ئاسۆ» بە قوربانی خەیاڵت

***

چ ناقەومێ عەزیزم، ڕۆحی «ئاسۆ»
لە نێو مەزرای جەماڵت گوڵ بکەم بۆ
هەتا شین نەبووە شەشپەڕمان لە سەر گۆڕ
دەسم شین بێ لە باغی سینەکەی تۆ

٦٨ تا ٧٠

## بۆ تابلۆی منداڵێکی برسی ئافریقا

بە کام تاوان زەوی تۆی کردە خۆراک؟
گلێنەی چاوەکانی دایکی برسی؟
کەوا داڵی مەرگ خۆی لێ مەڵاس دای
خەمی نان نایەڵێ لێشی بترسی

***

لێیان پرسیت ئەرێ ڕازیت بە دونیا؟
کەچی ئاواش ژیانت پێ دەبەخشن؟
هەرا کە، گوێی مەلایک کەڕ کە، بەشکم
لە خەو هەستن ئەوەی لەو بەرزە پەخشن

***

لە سەر ئەم تۆپە خۆڵینە نییە کەس
ئەوەی لێرانەیە گوێی خندراوە
هەزار ناڵەت لە گوێی واندا بە پووشێ
لە بەر لەززەت سیلەی ڕەحمەت بڕاوە

***

ددانت سپیەوە بوو ئەی سیابەخت!
درەختێکیش نەبوو بمری لە بنیا
بە ڕۆژی ڕوون ئەتۆیان کردە خۆراک
ڕەشی شەوگاریان بەش دای لە دونیا

***

بە گوێی بادا بچرپێنە خەمی ژین
دەبا بیبا بەرەو چوارقارەکەی تر
بڵێ مانای چ بوو دنیا لە بۆ تۆ
بە غەیری برسیەتی و بەرتاوی ئاگر؟

***

وەکوو ڕەنگی لەشت تاریکە «ئاسۆ»ت
بڵێی هەر تا قیامەت هەر وەها بێ؟
مەترسێ مستی پۆڵا هاتە کایە
دەبێ ڕۆژێ گەلی برسی ڕەها بێ!

بۆکان۔ ۷۷/۸/۱۰

## بەهار

کەژاوەی هەورێکی سپی
ڕازاوە بە سەبر و سووکی
لە سەر خوانی زینی شەماڵ
بەهار دەهێنین بە بووکی

سەر گۆی مەمکی چڕۆ خڕ بوون
شیری ژیانیان تێ زاوە
زاوای سوروشتە کێو و کەژ
ڕەنگی سپی بووی گەشاوە

وەڕەز بووم لە هاژەی شەقام
شاری ئەوینە دەشت و کێو
لە سەر ئێسکی نەونەمامان
هەڵاڵە زەردەی هاتە لێو

خۆڵی ویشکی خاکەلێوە
تەیەممومی نوێژی بوونە
جریوەی خۆشی مەل و مۆر
وشەی گۆرانی دەروونە

هەتاو شاعیر، چیا شیعرە
مەزرا چیرۆکی ئەوینە
پەڕەی کاغەز چیمەنێکی
نەنووسراوی سەوز و شین

بێ وشە و خەت بەڵام پڕە
لە شیعری ڕەمزاوی ژیان
قافیە گوڵە، دار ڕەدیفە
هاژەی شەتاو مەعنا و بەیان

لەم وەرزی ژینی دووبارە
منی تەنیا چ دڵتەنگم!
دەڵێی کەوی پەڕەوازەم
بێ باڵ، بێهێز، گێژ و مەنگم
ئاخ بۆ دەستێ بگرێ باڵم
لەم مەنگییەم بێنێتە دەر
بەشکم کانی وشکی هەڵبەست
بدا لە قوڵپە و بێتە سەر

کانی هەژار، کانی زوڵاڵ
کانییێ ڕووناک بەرەو دەریا
بڕژی، باژوێ و هەناو بدا
بەو گیا و گوڵەی وا لە بەریا

**دەسنویێژی شیعر**

لـــه تـــەنیـــایی و دڵـــی دەشـــتا
دەچـــــریکێنم دەنگـــــم گـــــڕە
لـــــه دەروونـــــەوە دەســــــووتێم
پـــە نجـــەی نووسینیشـــم ســـڕە

ئـــاخر چ بکـــــەم شـــاعیرێکی
دەس‌بـەسـەر، بـێ چـارەنووسـم؟
هەر کە ڕێم کـەوتـە ئـەم شـوێنە
نـــاتوانم شـــیعرێ نـــەنووســـم

سیخان- جەژنی ڕەمەزانی ۷۳
۱۳۷۳/۱۲/۱۱

## باوەخولێ

شــەپــۆل بــۆچی وا بــەلــەزە؟
دەیبـا هــەرچــی وا لــە بــەریــا
هــەڵــدێری چیــای لا ســەختــە؟
یــان خۆشــە جــێژوانی دەریــا؟

نازانــێ گــەییــە نێــو دەریــاش
چــوار دەوری هــەر لــێ دەتــەنــن!
شــــەوی ســــامناکی بــــارانیش
تـا ڕۆژ وەک مـەشـکە ئـەیـژەنـن!

ڕۆبــار، کــانی، دەریــا، شــەپــۆل
هــــەتـــاو و هــــەور و بارانــــە
مــــەبــــەســـتی بنیــــادەم چییــــە؟
یـــاخۆ خـــوداش لـــەم کارانـــە؟

دەریـــا گێـــژە، زانـــا گێـــژە
کــەس هیچــی لــێ حاڵــی نابــێ
خــــەیـــاڵ نابێتــــە نێــــو زانــــین
دەعبــــای کێــــوی ماڵــــی نابــــێ

**دەسنویێژی شیعر**

جار جار خۆم لە خۆم ون دەبم
دنیا دەبێتە نوختەیەک
ئەم خەڵکە بۆ هێندە کاڵن؟
ئاخ بۆ هاوڕێیی پوختەیەک!

هاوین، پاییز، زستان، بەهار
سەوزی و زەردی و بەرزی و نەوی
بە دەوری یەکدا هەڵسووڕان
مانگ، ئەستێرە، ئاسمان، زەوی

ئێستا زانیم ڕەمزی چییە
ئەم ڕۆینە کوردییەی جوانە
کاکڵی ژینی بنیادەم
بە دەور خۆدا هەڵخولانە

ژیان بۆتە باوەخولێ
تا هەڵسوڕێی گێژتر دەبی
«ئاسۆ»! بەرزە دەست پێی ناگا
تا بەرز بێ جێی لێژتر دەبێ

ئاستارا- ٧٧/١١/٢٥

## قوربانی

قوربـان وەرە قوربانـە!، قوربـان وەرە قوربانـە!
سا بمکە بە قوربانی ئەو زولـف و قـژە جوانـە
لـەم لامــەوە نـەورۆزە، لـەو لامــەوە قوربانــە
«ئاسۆ» بە فیدای حاڵت، کوا ماچێ بە جێژنانە؟

بۆکان_ ٧٨/١/٨

## دوایین پەیام

ئازیزەکەم ڕوک پێت بڵێم     کاتێ دڵ یادی تۆی تێ دێ
دەفتەری شیعرەکانیشم     هەر بۆنی پاکی تۆی لێ دێ
ئەو کاتەی دەدوێی لەگەڵم     گوێچکەی خەم و دەردم کپە
ئەرێ کام دەنگ بەڕێزترە؟     لە دڵداری و ژوان و چپە؟
زێڕی سەر باڵی پەپوولە     لەو کاتەوە کە منداڵ بووم
قاڵی کردم، هەستمی کڕی     تا لەگەڵ گوڵدا هاواڵ بووم
بەڵام ئێستا پاش چلوسێ     خولی ژینی پڕ ئەوینم
تۆ هەستی شیعریمت کڕی     خۆم لە نێو تۆدا دەبینم
ئەم پەیامەم دوا پەیامە     تۆ بی خوا لێم دڵگیر نابی؟
گوڵی گوڵدانی شیعرم بی     هەر دەمێنی و قەت پیر نابی
تۆ هەوێنی شیعرەکانمی     دەسگیری ڕێی تاریکمی
تاڵێ مووت بە دنیا نادەم     هۆی خەیاڵی باریکمی
دیارە تۆش وەک من لەم دنیا     غەریبی و هاوڕێی ئەستێرەی
گەدای بەردەرکی عاتیفەی     شەیدای ڕووناکی و پەنجێرەی
دژی ترس و درۆ و فێڵی     قومری ئەسیری بەر پەردەی
ناڵەت تەوقە و دەچێتە مل     شەیدای قاقای سەر ئەم هەردەی
تۆ کانیاوێ ڕوون و پاکی     لە چیای سەربەرزی کوردستان
گەرووی قاقات ئەخنکێنن     هاوار بۆ عەرزی کوردستان
هەرچی مەلی شەیدایەتی     لە خاکی خۆی غەوارەیە

## محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)

قسەی سیمی تەلەیفونیش پاکی دەڵێی شەوارەیە
ئێستا زانیم چاوی چاوم هاوار هەزار ساڵ بخنکێ
سکووت پڕپڕ لە هاوارە لەگەڵ فرمێسکا هەر ئەتکێ
من تکەی فرمێسکەکانت سەر بە سەر بە گەوهەر نادەم
لە خاکی خۆمان غەریبین بشرۆی دەستت لێ بەرنادەم
بڕۆ! بڕۆ! خوات لەگەڵ بێ! من لەمێژ ساڵە بێ‌نازم
لە سەر بەرماڵی شیعری خۆم خۆشبەختیت لە خوا ئەخوازم
ئیدی هەتا فەسڵێ گوڵ بێ گوڵی ڕووی تۆم لە بیر ناچێ
لێم‌گەڕێ هەر لێو توونی بم لە بۆ سرتە و بزە و ماچێ
دڵی «ئاسۆ» دوایین پەیام هەڵدەقرچێنێ پێست و ئێسک
خوات لەگەڵ بێ بەجێم بێڵە لەگەڵ خەم و شیعر و فرمێسک

بۆکان- ٧٨/١/١٨

## بێوەفایی

پەریلەکەم! ئەو شیعرانەی بۆ تۆم گوتبوون
قەرار بێ بیانشۆمەوە
شەرت بێ تۆ جامی بادە بی و منیش تینوو،
هەتا دەمرم نەتخۆمەوە
لەو شیعرانەی بۆ تۆم گوتبوو ئیدی حاشا،
شیعری من نین، هەموو زۆڵن
ئەو قەڵەمەی بۆت هێنابووم دەیشکێنم،
بۆ نووسینی شیعرم کۆڵن
ئەو دەفتەرەی پەڕەپەڕە بۆنی زولفا...
نی تۆی لێ دێ، دەیدڕێنم
عاقڵ ئەبم لە سەر بەرماڵی شیعری تەڕ
هەر هەوەسبازێ نەدوێنم
ئەو شەوانەی تاکوو بەیان چاو بە فرمێسک
دەگەڕام بۆت لە شیعری جوان
عومری من نین، عومری من نین، حاشا لێیان،
پەشیمانم، زۆر پەشیمان

ئەو گریانەت وا لە بۆ من بەسۆزترین...
گۆرانی بوو، گوێی لێ دەخنم
من پەپوولەی دەوری گوڵم، بێوەفا بم
گەر هەڵاڵەی دڕوو بچنم

ئەو نامانەی بۆم نووسیبووی- دەستم بشکێ-
نامەی هەست و دڵپاکی بوون
ئەتۆ و پاکی؟ بڕۆ، بڕۆ، حاشا لە پاک!
بەری داری غەمناکی بوون
تۆ شۆڕەبی سەر کانیاوی ڕوونی کورد بووی؛
بەڵام ئێستاکە گۆڕاوی
ئەتۆ بازی خوڕێنک بووی بەڵام ئێستا
بە بیری غەربی دۆڕاوی
منیش ئەو شاعیرە کوردەم، تاوانی من
بێجگە لە چپە و دڵداری و ماچ
گوناح لە نامەمدا نییە، ئەگەر بێتوو
وێنەی مەسیح بمدەن لە خاچ
ئەمشەو لە داخی تۆ وشە دەڵێی دەرزین
لە ناخی هەڵچووم ڕۆ دەچن
ئەستێرەکان دەزیرپێنن، بۆ من دەگرین،
هەر لە چاوانی تۆ دەچن
ئێستا زانیم ئەستێرەش هەر وێنەی ئەتۆ
بێوەفان و بەیان دەڕۆن
بڕۆن! بڕۆن! لە پاش ئێوەش جوانی و وەتەن
دڵداری مێژینەی «ئاسۆ»ن

بۆکان- ٧٨/١/٢٢

## دوو بەیتی

دڵی کێ وەک دڵی من دایمە کەیلە؟
هەور کەی وەک ئەمن گریانی مەیلە؟
لە مەجنوون گەر بپرسن: بۆ چتە چاوت؟
دەڵێ: «چون جێی خەم و گریانی لەیلە»

بۆکان- هاوینی ٨٦

## لە بەرزییەوە

خۆزگە مـەلێکـی کۆچـەر بـام　　بۆ سەیری گەرمێن و کوێستان
یان بولبولێکی دەنگ‌خۆش بام　　بمخوێندایـە بـۆ دووردەسـتان

***

باڵــندە بــام بــە زمــانی گــڕ　　هاواڵــەکــانم گــاز دەکــرد
لــە نووچکــەی بڵــیندتر چنــار　　هێلانەم بـۆ خـۆم سـاز دەکـرد

***

ئیـدی دوژمـن نـە لـە زمـانم　　نـە لـە جێـی ژینـم دەگـەیـی
لــە ترسـی سـووتمانی وتــەم　　مێشکی بیری چەوت دەمەیـی

***

خۆزگە هەڵـۆی چیایـەک بـام　　لووتکەی، بـەرز، بـەرز، بـەرز
بــە چــاوێکی پــڕ لــە مانــا　　لـــەوێـــوە دەمڕوانیـــە ئـــەرز

***

لـە بـەرزیـڕا مـەلی خـەیـاڵ　　هێندەی دیکەش تیژبـاڵ دەبـێ
هەرچی جاران لات بڵیند بـوو　　لـەبـەر چاوتـدا چـاڵ دەبـێ

***

هـەرچـی ڕژد و گـرد و خـڕە　　لـــەبـــەر چاوتـــا گلۆڵـــەیـــە
ئەوەی جاران پێت گەورە بـوو　　ئێسـتا لات چـەن چکۆڵـەیـە

***

**دەسنوێژی شیعر**

لـە پـەنجـەرەی عـەینـەکـەوە دەڕوانمە ئاسۆی دووری شـار
هـەورێکـی گـەواڵ و ڕووتـاڵ خۆی لە ئاسمان داوە حـەشـار

***

زەوی لـــە ئاسمـــانی چنـــۆک چـــاوەڕێـــی دڵـــۆپێ ئـــاوە
چـاوی ئاسمـانی بـەزەیـیش لـە ئاسـتی تینـوان قووچـاوە

***

ئەی من چ بکەم مەلێ بێبـاڵ؟ لانـەواز، بـێدانـە و بـێئـاو؟
ڕێگەی هەڵفڕین لـێ قاچـاخ؟ لـە هێلانـەدا هـەڵـکورماو؟

***

بـــەڵام نـــا، نـــا، باڵـــەفرتـــەی نێو قـەفـەزیـش هـەر پـەروازە
شووڵی قەفەز قرچـۆک دەبـن ئاخری هـەر دەشـکێ دەروازە

***

ئـــەوســـا هـــەڵـــفڕین ئـــازادە بۆ لووتکە، بۆ ئاسمان، بۆ بەرز
ئەوەی لە سەر سـوفرەی زەوی لە ترسی نان لێی هاتووە لـەرز

***

لـەو سـەرەوە تـەماشـای کـەی قاقـــا پێیـــان پێـــدەکـــەنی
هـــەمـــوو چکۆڵـــە دەبنـــەوە دارا، نـــەدار، هـــەژار، خـــەنی

نۆبار ـ ٧٦/٣/٢

## شەپۆل

**بۆ چیای کورم بە بۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونیەوە و**
**سەرەتای هەژدەهەمین هاوینی ژیانی**

شـەپـۆل ئـەڵـێی مـاری تینـوون
بـەرەو سـینگی قـەراخ دەکشـێن
گــوڵئــەســتێرەی ئاسمــانێکن
بـە سـەر ئـەرزیـدا ڕادەخوشـێن

دەریـا مـەشـکەی ماڵـی خوایـە
هـــەتـــا ڕۆژ پـــەری دەیـــژێنن
لـە دوورتـرین سـووچی شـەوا
کچـی خـۆر بـە بـووکی دێـنن

خـۆر دەم لـە سـەر پشـتی ئاسـۆ
ئاســۆیەکــی مــەیلــەو ئــاوی
سـوور و شـین، زەرد و نـارنجی
دێتــە ســـەر بـــە ئاڵـــۆزکاوی

پــەڵــەپــەڵــە هــەوری سـپی
لــە بـەردەمیـا سـەمـا دەکـەن
وێنـەی ئاوێنـەی بـەر هـەتـاو
سڵاو لـە بـووکی دەریـا دەکـەن

شەپۆل شەپۆل چەندە بەلەز
یەک دێ و یەکتر بەجێ دێڵن؟
ئەڵێی جووتیاری دوا کەوتوون
تەویڵی دەریا ئەکێڵن

گوڵی ورمێ! ئەرێ تۆخوا
چەن ساڵە وا بێئارامیت؟
تامیشت بۆتە فرمێسکت
هێندە گریای بۆ ناکامیت

تاو بێهۆقرە، شەپۆل تووڕە
کەف ئەچێنێ تا دووردەستان
پێم وا پەشیمانە لەوەی
بەجێی هێشت سەوزایی کوێستان

شەپۆل ئەگری و شیوەنیەتی
ناتوانێ بڕوا سەرەو ژوور
بیری پاڵ بەفراوی کردووە
ئاوا دەیکاتە لوورەلوور

پەلەوەر وەک خاڵی ڕەشی
ڕوومەتی دەریا لە دوور دوور

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

بێدەنگ و سەدا هەڵدەفڕن
تا ئەوپەڕی سنووری نوور

شەپۆلشەپۆل ئەیدەن لە کۆڵ
نەک بە ڕۆینە، هەر بە چەپی
بە تەوژمی پەنجەی دەریا
بەردی قەراخ تەزی لەپی

بەندەری گولمانخانە ورمێ- ٧٦/٤/١٣

## شەوی یەلدا

بۆ شاگردەکانم

ئـــەمشـــەو پۆلـــێ کـــۆتری ســـپی
پـــا بـــەســـراو بـــە داوی خـــەیـــاڵ
هـەودای تـەپکـەی مێشـک ئـەپسێنن
وێکـــڕا ئـــەدەن لـــە شـــەققـــەی بـــاڵ

ئـــەمشـــەو پۆلـــێ پـــەپوولـــەی کـــز
بـــەڵام ڕەوەک، بـــاڵناســـکی ســـڵ
پیلـــــەی زســـــتانی ئـــــەپســـــێنن
دەفـــڕن بـــەرەو جێـــژوانی گـــوڵ

ئـــەمشـــەو شـــەمـــاڵ بـــە شمشاڵـــی
حـەنجـەرەی شـیعرێکی سـەرسـەوز
خـۆش‌خـۆش ئـەتووڕێنـێ بـە گـوێی
ئـــەو ڕێبـــوارەی ئـــەدا وەنـــەوز

حـــەیـــران، ســـوارۆ، زەردە پـــاییز
لـــە دەنـــدووکی ســـووری مـــەلدا
دەبنـــە ســـەمفۆنیـــای ڕوونـــاکی و
دەشڵـــەقێـــنن شـــەوی یـــەلـــدا

شـــەوی تـــاریکی پـــر حـــەســـەس
تـــەنانـــەت شـــەوقـــی ئـــەســـتێرە
بـــە هـــەوری ڕەش حـــەشـــار ئـــەدرێ
لـــــەبـــــەر وەی شـــــوعلە ڕادێـــــرە

لێـــرە ســـــەفی درۆ و کـــــەڵـــــەک
تـــا عـــەڕشـــی خـــودایی ئـــەفـــڕێ
کـــوا شـــوعلەی گـــوڵئـــەستێرەیـــەک
تـــــا ئـــــەم ڕێـــــزەیـــــان دادڕێ؟

کـــوا هـــەناســـەی شـــیعری متفـــەڕک؟
ودمـــی داری وشـــکی ســـەرچـــاک
بخاتـــــە نـــــەشـــــئە و شـــــنەوە
چـــرۆی بێتـــە دەر لـــە ژێـــر خـــاک؟

جـــــا لـــــەم شـــــەوە تاریکـــــەدا
مـــن دڵـــخۆش کـــەم بـــە کـــام هیـــوا؟
کـــــــام ئـــــــاواتم بلاوێـــــــنم؟
ســـەر بکێشـــمە کـــام پـــەســـیوا؟

چاو لە هەر سووچێکی دەبڕم
جوانی غەریب و بەندییە
کوا شەپۆلێ تووڕەی بەسام
بشڵەقێنێ ئەم مەندییە؟

سرتەی لێوی دڵدار نەبێ
لۆکەی غەم گوێچکەی کەڕ کردووم
چپەی پەریانەی تۆ نەبێ
ئاوماڵێکی شەتاو بردووم

وەرە لەم شەوە تاریکە
چرای ڕێگای ئەوینم بە
وەیشۆ غەوری شووشەی دڵم
بەیداغی سەوزی دینم بە

وەرە با زولفت پەرچەمی
ڕەش‌پۆشانی داخ‌لەدڵ بێ
ئەمشەو درێژترین شەوە
لەگەڵ بسکی تۆ کامڵ بێ

وەرە با مەوجی ئەو دەریای
چاوت بمانخاتە مەلە
کاروان ڕۆیی، درەنگە شەو
با هەستین لە خەو بەپەلە

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

شـــەوی یـــەلـــدا بـــا درێـــژ بـــێ
حـــەریفـــی زولفـــی تـــۆ نابـــێ
زولفـــــت ڕێنـــوێنی ڕوونـــاکین
لـــە شـــەو مـــەترســـێ، بـــا وا بـــێ

ئـــــەمشـــــەو درێژتـــــرین شـــــەوە
لـــەم شـــەوگـــارە ڕەشـــەی پـــاییز
لـە سـەر سـوفرەی دەوڵـەمـەنـدان
شـــووتی و ئاجیـــل کـــراوە ڕیـــز

لـە سـەر سـوفرەی ڕووت و برسـیش
هـــەناســـەی ســـارد و ئـــاوی چـــاو
شـــەوچـــەلـــەی شـــەوی یـــەلدایـــە
لـــە شـــادی و خۆشـــی بـــەشبـــڕاو

بـــــەڵام تروســـــکەی هیـــــوا دێ
ئاســـۆی هـــەژار پێـــی دەبـــێ ڕوون
تـــۆ ئـــەو «ئاســـۆ» ڕوونـــەی مـــنی
وەرە بێـــــزارم لـــــە نـــــەبـــــوون

بۆکان- شەوی یەلدای ١٣٨٠

## هاوتای هەتاو

بۆ ژیلای جوانەمەرگ

بەیان هێشتا
لە پەنجەرەی سووری شەفەق
سەری نەهێنابووە دەرێ
یەک‌یەک ئەستێرە بێ‌شەبەق مابوون؛ بەڵام
هێزی چاوترووکانێکیان هیچ پێ نەمابوو لە سەرێ
وڵات کڕ و کپ و بێ‌دەنگ
کانی چۆڵ و
هەوا ساردی بەیانێکی دوای شەوەزەنگ
مەلان لە ناو هێلانەی شەویاندا کڕ خەو
کچێکی ڕەش‌پۆشی تەنیاش لە سەرچاوەی کانی، دڵ‌تەنگ
دەرزییێکی زێواژنی سپی، گۆزەی کانیاوی بوو
هەر سات ئەیگرت بەم دەستیەوە
تاوێ ئەیدا بەو دەستیەوە
سینگی «ئاسۆ» سیبلی تیرێژی چاوی بوو:
«ئاخۆ کەنگێ هەتاو هەڵدێ با دەرزییەکەم لەگەڵ هەتاو بگۆڕمەوە»
بەیان هێشتا
لە پەنجەرەی سووری شەفەق سەری نەهێنابووە دەرێ

## محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)

مانگ مجومعەیەکی سپی هەڵپڕووکاو و بێزریوە
لە قەراخی ڕۆژاواوە کرنۆشی ئەبرد بۆ کانی و دەرزی و کازیوە
ئەمیش تاوێ بە پرچی مانگدا هەڵدەزنی و ئەکشایە سەر
چەن بێئۆقرە چاوەڕێ بوو خۆر لە ئاسۆ کەی دێتە دەر!

***

جارجار تەزووی بەربەیان پەنجەکانی لێ سڕ دەکرد
توندتر دەرزییەکەی ئەکوشی و بە هاڵاوی دڵی گەرمی
دەرزی و پەنجە و هەوری ساردی بە تەوژمی پڕ گڕ دەکرد

***

ئەو ئەیزانی لە چۆمی چاوەڕوانیدا دوورە بەستێن
ئەو ئەیزانی لە زستانی دڵلەدوایی دوورە گەرمێن
شلۆی نابووە پێش، پێش ئەوەی دیسان شەوەزەنگ شەونمی
ناو قەڵەمی ئاواتەکانی بچۆڕنەوە
چاوەڕوان بوو کەنگێ هەتاو سەر دەردێنێ و
دەرزییەکانیان بگۆڕنەوە

***

کەچی لەپڕ
بایەکی توورە هەڵیکرد
ڕەشەبای مەرگی لەنەکاو کردیە گوڵی خەزانلێدراو
تازە هەتاو خەریک بوو سەر بێنێتە دەر
ئەم دەرزی لە ناو دەستێکی و
دەستەکەی دی تکەتکی خوێنی جگەر

**دەسنوێژی شیعر**

بەرەو ئاسۆی نەمان ڕۆیی

ڕۆحی پاکی فڕی،

فڕی هەتا تەشقی ئاسمان ڕۆیی!

بەڵام هەتاو

لە پشت چیای ملبەکوێنا

دەرزیێکی نووری بۆ نارد و بۆی کردە دیاری

ئیدی ئەویش

بوو بە کچی نوور و هەتاو بۆ دوارۆژی ئافرەتانی کوردەواری.

سەقز ـ ٧٥/٧/٨

## خەمێ ڕەنگاوڕەنگ

هەموو ڕۆژێ لای ئێوارێ
خەمێکی سوور یا شینێ مەیلەو ئاسمانی
بەربینگی خەیاڵم دەگرێ
چاو لە ئاسۆی سوور دەڕوانم لە کاتێکدا ڕۆژ دەپەڕێ
بەشکم ڕەنگەکان ببنە یەک
بەڵام سەد داخ
سات لەگەڵ سات ئاسۆ ڕەشتر هەڵدەگەڕێ
لە ژێر چارشێوی شەوەزەنگ
خەمە ڕەنگاوڕەنگەکانم هەڵدەکورمێن
خەیاڵی من بەجێ دێڵن
لە ناو شیعری سپیسپی خۆ مات ئەکەن کڕ و بێدەنگ
شار، وەک شارە مێلوورەیەکی پڕغەوغا
ئاسمان، وەک دەریایێ بێسنوور
ئاسۆ، وەک چاوی کوڕکوژراو
دار، وەک دەستی پاڕانەوەی سۆفی خەمناک
گڵۆپەکان، وەک چەخماخەی هەورێکی دوور
دڵی منیش وەک خەیاڵی عاشقێکی کز و دڵپاک
پەنجەی پێنووسم کێش ئەکەن

## <u>دەسنوێژی شیعر</u>

بێهێز، غەمناک و کش و مات
نووکی قەڵەم دەڵێی تیرە و لە کەواندا یەخسیر ماوە
بەڵام هەیهات
ئامانج دوور و سێرە لە چاو هەڵگیراوە
لەم جەنگەڵە سامناکەدا!
ڕێوی پاشای باڵندانە و
شێر لە لانا بەندکراوە.
چ سەرمایەکی سامناکە!
دەستی قەڵەم قەڵەمکراو!
ڕێگەی جێژوان تیرئاژنە و درگای ئەوین گاڵەدراو
شیعریش وەک تەیرێ چەواشە
خۆ لە دیواری سینگم ئەدا
پەساپەسا واژەی شیعرم لێ دەبێتە فرمێسکی چاو،
بەرەبەیان
کاتێ چاو هەستا لە خەوێ
پەپوولەکانی نێو ناخم سەر لە نوێ دەچنەوە گوڵگەشت
ئەوسا ئیدی هێورهێور خەمی ئێوارەم دەڕەوێ
ئیدی ئەو خەمەم دەڕەوێ.

تەوریز / ٧٦/٢/٢٤

## خۆت مەشارەوە

ڕەنگت وەک نەرگس
خوێن هێندە شیرین
دەنگت: ئاوازی سێحراوی ئەوین
منیش تامەزرۆی سەوزایی و بەهار
گوێچکەم تینووە بۆ ئاوازێکی پڕ بێ لە سۆزی ئەوین و دڵدار
ڕووت وەک مانگە شەو
مووت ڕەنگ‌تەڵایی
منیش زار تاڵی گژ و گیا و کەکرە
یەکجار تامەزرۆم بۆ مژینێکی ئەو لێوە شەکرە
سۆمای چاوانم!
خۆت مەشارەوە
دەزانم وەک من دڵت بەتاسەن
ئەوەم زانیوە و عاشقی باڵات بووم
لە ئیشارەکەی ساڵی پارەوە

بۆکان- ٧٦/٦/٢٦

## زەلکە

کۆماکۆما پووشی بێدەستەڵاتیمم
له سەربانی ئازارەکان کردە گیشه و
چاوەڕوانی نەورۆزی بووم
کوا چەخماخەی هەوری بەزەییکی خوایی تا ئەم ئاگرەم بۆ
بکاتەوە؟
کرێوە نامخوێنێتەوە و
شیعری باران چەن دڵۆپە
له بن پێڵووی چاوەکانما قەتیس ماوە
ڕنووە بەفریش لووتکەلووتکە تریفەی دێ و
شەماڵ له بن مەقنەی کیژی قوتابی
خۆی حەشار داوە
منیش وەک کتێبی بێکەس
چاوەڕوانم دەستێ بێت و
لاپەڕەم هەڵبداتەوە
بین‌بین جامی شیعرەکانم بخواتەوە
شەقام زنجیری پاکانمە و چۆم
شەقامی چۆڵی ماسی
داوی خەیاڵ وەهای له خۆم پێچامەوە
هەزار «سەوزە» و «قاسپە» و «چپە» دەرمناکەن له کەساسی
بە جێی سەفا

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

حەوزی دەروون لیخن دەکەن

ئەستێرەکان لێم بوونە چرای جادوویی و
ڕێیماڵی خوام لێ ون دەکەن
کاکەشان بۆتە هەژدیها و ملوێنکەکەی سورەییام لێ هەڵدەلووشێ
شەو سەماگەرێکی پیرە و
ڕەقسی دەس و قەد و باڵای
لەگەڵ شەپۆلی مۆسیقای یەکناگرن و
چاوی بینەر لێی دەقووچێ
منیش قامبێژێکی سەیرم،
جاری وایە
حەنجەرەم گوێچکە کەڕ ئەکا و
جاری واشە
دەڵێی هاواری نێو خەوە
چریکەم تا لە خۆم نووسیم هەر بۆ لای گوێی خۆم دێتەوە
لە دەروونمەوە سەر ناکا و تەنانەت خۆشم نایبیسم
بیشیبیسم نایناسمەوە
چەن گوناحن ئەو دەنگانەی
لە گەروو زیاتر نابیسرێن!
قەت نەوێژران
مشتەرییان هەوداکانی ئەو قوڕگەیە
کە هەر لەوێ زان و نێژران
شەپۆلێ بۆنی بەهەشتی

لەگەڵ ڕابوردنی پۆلێ پەری
به ڕۆحمدا هاتن
وا ڕۆحمیان داگیر کرد لێم
چاو، بوو به کۆرپەی سەرشێواو له شەقامێ چۆڵ و قەوغا
دڵ، بوو به موتریبی عاشق، لەگەڵ مانگەشەو هاته دوو
به زمانی دووکەڵ و ئاگر
کەوته ناو حاڵەتی خۆی و ئەمجار دای له سیمی ئاخر
من و ڕۆح و ئەتۆ و ئەوین
تۆ و ئاهەنگ و من و بەستەم
مانگ و ئاسۆ و چیای بێدەنگ
بووینه لەشێ و تەوژمێ سارد له خۆی گرتین
بۆنی بەهەشت له دەماغما
شوێنی نەما و
هەموو بۆن و دەنگ و ڕۆحێ
دەرزیئاژنیان کرد جەستەم
بەیان، به جریوەی مەلەکان
له نێو پۆلوو و ژیلەمۆی ژان خۆم دۆزییەوە
بەرەو ئاسۆی ڕوون ڕێکەوتم
دەشمزانی دوایین ساتەکانی شەوە
هەر بۆ سەر چۆم
هەر سەرکەوتم
کەچی ڕوانیم هەتا لووتکە زۆری مابوو
ئێسک و پلووسکی ڕێبواران هەروا مابوون،

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

لەملاولاوە
لەبەر چاوم هەموو سەریان تیژتر دەبوو
هێندێکیان دەبوونە خەنجەر
هەتا زۆرتر دەڕۆیمە سەر
تێکەڵ دەبووم لە هەور و تەم
زۆریان لێم دەبوو بە قەڵەم
منیش بەجێی شیعری دەروون
هەر ئەوانم دەنووسیەوە
هەتا خۆشم لەبەر چاوی تەما ون بووم
ئێستا پەلەقاژەی ژینە
لە ناو زەلکاوی ڕۆچووندا
ئێستا دەمەقاڵەی ئەشقە لەگەڵ عەقڵا
لە کاتی تاریک و ڕووندا
منیش بێ لەمپەر و هیوا
بێدەسەڵات، چاوەڕوانم
بە بەر چاوی سروە و بەرەبەیانەوە
پۆلێ پەری
جەستەی خۆم شیعرەکانم هەڵەوژێرن
خۆشم لە دوور سەیریان دەکەم بێئیختیار
چاوەڕوانم لێم گەڕێن بەرەو لووتکە ڕێگا ببڕم
یان بەزەلکەدا بچمە خوار...

بۆکان ـ ٧٧/٧/٧

## تەپکە

ژیان بوەتە ژان لێم و ئەمشەو وشە
وەک ڕەوە ئاسکێکی سڵە
مۆسیقای خەڵوەتی ئەمشەو
ئاهەنگێکی غەمگینی گیرانی دڵە
ئەیاخییەکەی وڵاتی بەهار!
لە بن کام گوڵ دەتشارنەوە نەیارانت؟
بۆ نازانن لە بن هەر گوڵ
سەدان بولبول ئەچریکێنن بۆ یارانت؟
لە بن کام سێبەری عەشقا دەتشارنەوە؟
سێبەر دەکەن لە ڕووی هەتاو؟
بۆ نازانن ناوت تیشکە و تریفەی دێ و
گزینگ ناوت ئەدا لە قاو؟
ئەی چەخماخەی دڵی کوردان!
ئەم گورگانە لە نێو کام هەور دەتشارنەوە؟
بۆ نازانن وتەکانت لەگەڵ پەڵە
بۆ گەلی کورد ئەبارنەوە؟
ئەرێ بڵێی عەرز چووک بێ
وا لە هیچ کوێی ئەم جیهانە بەرینەدا
جێیێ بۆ تۆ بەدی نەکرا؟

## محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)

یان هەروایە ئاکامی کورد لەم ژینەدا؟
نە مووسا لە سەر کێوی توور تکای کرد و
نە عیسا هەناسەی پیا هات
فەلەکان بوونە دەس‌کیس و
دالاشەکان هێناتیانەوە بۆ وڵات
نەیانزانی تۆ بارانی پەڵەی مامە هەرزە ڕێی دارا ببڕێ
تۆوی ئازادی ئەچێنی و وێنەی شاخە سەربەرزەکان هەر نامرێ
دڵنیام تا پشتیوانت، دەستی دۆعای سەدان دایکی پاکی کوردە
هەر سەرسەوزی وەک دار بەڕوو؛ چونکا ڕیشەت
لە بن ئاو و خاکی کوردە
ڕیشە لە ئاو چلۆن وشک دەبێ گیانە
هەزار ساڵی هەڵپەڕتێون؟
مەلی عەرشی ڕووی لە «ئاسۆ»ن، دڵنیا بن
هیچ ڕاوچییەک نای‌ئەنگێون!

بۆکان- ٧٧/١١/٢٨

## باران

چاو و دڵی ئاسمان و کچ تەڕ بن جوانە!
ئەم خاوەنی ڕێژنەی عەشقە و
ئەو بارانە!
هەور ئەگری، ئەبارێنێ، ژینی پێیە
ژین بێ ئەوین مانای نییە
ئەی خاوەنی ئەوین کێیە!؟

سەقز/ بۆکان- ۷۷/۱۲/۱

## سەفەرێکی بێکۆتایی

بۆیەکەم جار
لە بەر چنگی ئەم خەریتە پشیلەییە پێم نا دەرێ و
بەرەو قیبلەی ئاواتێکی چەن ساڵەی خۆم
نوێژی سەفەرێکم دابەست
کێو هەر کێو بوو
ئاو هەر ئاو بوو
دار هەر دار بوو
ئەوەی بۆ من فەرقی هەبوو
نیگای خەڵکی لادێ و شار بوو.
ئێستا من وام لەوپەڕ سنوور
تازە زانیم سنوور خەتێ بێمانایە
ئێرەش وەکوو ئەوێ وایە
بەڵام لێرە، خەڵکی زمانیان ئازارە
خەت و جل و بیر و بڕوا ناشارنەوە
بافتی شاریش دێهاتییە
مەتعەمەکان چێشت ناخۆشن
کەوچک و چنگاڵ قاتییە
کەچی بەسەر ئەم حاڵەشدا
من ڕەگ ڕەگم هوشیار نییە
چونکا لێرە ئەوەی بۆنی بێگانە بێ هیچ دیار نییە
فەرقی چەکوش و بزمار نییە

**دەسنویێژی شیعر**

شوێنێ لە شاری مار نییە
لێرە شەوان ئەستێرەکان نزیکترن
زۆر گەشترن
خەڵکی بە تاسەی مافەوە بە لای یەکدا ڕانابرن
کچان ڕوومەتیان سوورترە
گومە ترسی چاوەبڕکێ
هیچکەس چاو لە یەکتر ناکا لە پشت پەنجێرە و دوودەری
کە چوونە دەر ژنان لێرە بێ ڕووسەری
هیچ ناترسێن لە تووسەری
خاک هەر خاکە
ئاو هەر ئاوە
دووکان پڕن لەوشتانەی لەولا ئەمدین
بەڵام لێرە پەنجێرەی دووکانیان بە زمان خەتێ نووسراوە
ساڵەهای ساڵ من وەک دەروێش هووی بۆ دەکەم
وێنەی سەرباز ساڵەهایە شەوان تا ڕۆژ
بە خەیاڵ یەکدووی بۆ دەکەم

لێرە ترس غەوارەیە
لێرە ئەسکیناس پارەیە
لێرە ماشێن سەیارەیە
لێرە هەناسەهەڵکێشان زۆر سادەیە
شادی سوارە و غەم پیادەیە
کەمێ بێنەزمی گەر هەبێ
هەی ئەوەیە

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

ژینی سەربەستی بۆ ئێمە ڕەنگێکی کاڵ و سادەیە
ئێرە وڵاتێکی دییە، پێتەختەکەی دڵی منە
ئەگەر شەوگەلی تاریکە، ڕێگا ئەگەر سەخت و ئەستەم و باریکە
بەوەی خۆشە غەوارە و ئەجنەبی ونە
بەرانبەری پیاو و ژنە
لێرە ئەگەر خاک توونییە، دیوار نەوین، شاریان کپە
لە عەوەزدا زاریان پڕە لە دڵداری و ژوان و چپە
ئێرە شاری وڵاتی لێکبڵاوی دڵمە و
لە وڵاتە یەکگرتوەکان، لە واشنگتۆن، لە نیویۆرک
کاخ ئەڕووخێ
تەرم ئەسووتێ
خەڵک هەڵدێن
بەڵام لە نێو دڵی منا، لەم شارە خاپوورەی جاران
گوڵی شیعری بە یادی سەربەستی کوردان
لە قووڵایی دڵما ئەڕوێن

قەڵادزێ ـ ١١/سیپتامبر/٢٠٠١

# ئاگر

ئێوارەیەک
وەک نەورۆزی ساڵی ساڵان
شاعیرێکی سەرماگەستوو بەجێی پووشوو
وشەی بۆ شیعری کۆ دەکرد
سەرنجیشی نوقمی لێڵی ئاسۆ دەکرد
هەر کە دیتی ئاسۆ لێڵ بوو
بە دوای سێ وشەدا وێڵ بوو
ئازادی و گوڵ و ڕێبەندان
ئەمجار هێنای لە پەنای یەکتری دانان
لە هەر وشە یەکەم پیتی لێ هەڵگرت و خستیە سەر یەک
لە شەوێکی گوستەچاوی وڵاتداگر
لە سەر نووچکەی ناڵەشکێنە
هەڵی کرد و بوو بە «ئاگر»!

بۆکان- ٨٠/١١/٢

## ڕامانێک

بەرد، گەرما
جریوە و قەڵبەزە
چۆم، قومقومۆکە
من و خەیاڵ و سکووت و سەرگێژی
ئای بیرەوەری منالێم
پەپوولە سپیەکانی سەر گوڵی سووری دڕوەشینە
چەندتان غەریبی دەکەم
«خۆم دارەبیەکەی ڕیشە کەنیاوم»
لە سەر بەردیش ناوم ون ناکەن
ئەو چاوە نەرمانەی فێری دڵدارییان کردم
لە ژێر هیچ بستە ئاسمانێک
شوێن پێم ون نابێ لەم سەرزەوینی عەشق و عاتیفە و شیعر و خۆشییەدا
جارجار
قولپەی گریانی سەوز دامدەگرێ و
لە یادی یارانی جاران
ئیدی بەرد بۆ قومقومۆکە ناخەم
تا تەماشام بکا تەماشای دەکەم
ها وەرە ددانەکانم ببژێرە
ئەوەتی لە تۆ دوورم ئەوانیش تاقولۆق بوون

## دەسنوێژی شیعر

بیری بژاردنی تۆ دەکەن
ئەم کێوانە جاران بۆ هێند لای من بەرز بوون؟
ئەم هەستەی ئێستام بزر؟
بەڵام ئێستا ئەوەی جاران لام بەرز بوو بزر بووە و
بەرزەکانیش نەوی نەوی نەوی نەوین
ماسی قولاپچەشتە
برسیەتی چەشتە و هەویر
گەرما و
چاییەکەی نێو کترییە ڕەش
ئێستا فێنکاییم پێ نادا
ئەم ساردە هەناسەی ناو یەخچاڵ و فلاسک
کێ ماوە؟ کێ ڕۆیی؟ ئەی بۆ کەس نەهات؟
یان هەڵتەکاوە داوێنی ئەم چۆم و باخە لە شالووری شەیدا
بەڵام نا
«بۆران» هەناسەی گەرمی شیعر دەڕژێنێ
بە سەرکاغەزی سپی دڵی ڕەنگی مناڵیم و بێداریدا
بەم خاکەی قەومی پاکاندا
ئاسۆش هەر وا سوورە لە سەر خەمی خوێنی پیاوچاکاندا.

## ماچ

**بۆ ماچە مێژوویی‌یەکەی مام جەلال و سەددام**

چۆلەکەیەک ددانی مارێکی ماچ کرد
مار نەیوێرا هەڵیلووشێ!
هەڵۆ کوتی:
ئەرێ نەترسای ماچت کرد؟
ئەویش کوتی:
«ماری ترسەنۆک چاترە
من دەزانم لە پشت سەرمۆ
مەترسی چاڵ و ئاگرە»!

بۆکان- پاییزی ٧١

## هێرۆ

گوڵە هێرۆیەکی سپی پرسی لە هێرۆیەکی سوور:
«ئەریٚ تۆ بۆچی وا سووری
دەڵێی بووکی پەردەی نووری؟»
گوتی: «گیانە دەزانی من بۆ سووراوم؟
لە سەر گۆڕی شەهیدێکی گۆڕغەریبی کورد ڕواوم!»

سنەـ هاوینی ٦٧

## کەڵکەڵە

بە یادی تۆ
نەما جێیەک
جاران سرتەی تۆم لێ بیستبێ و
نەچمە ئەوێ
بۆنی یادت
گوڵاوێکە و پێی مەست ئەبم
دووریت خەمێکی تازەیە و
ئەمهەژێنێ
بەڵام گیانە
سبەی بۆ من مانای نییە
بەبێ یادی قسەکانی
پێرێ و دوێنێ!!!

ساروقامیش- ٨٥/٨/٢

## سەمای پەری

لەبەر سەمای پەری جوانی لێم دەپسێ هەودای ئەندیشە
جوانی و هەوەس
فەقر و درۆ
ئەوین دەکەن بە گاڵتەجاڕ
ئاخ ئازادی!
ئەوەندەی هەنگوینت هەیە
چزووی ناحەزیت پڕ ئێشە
ئایا ئەوینە یان هەوەس؟
ئەمن نازانم چ باسە!
بەڵام لێرە لە باکۆی پاتەختی عەجەم
من هەر دڵم
لای بۆکان و کەرکووک و وان و «سیواسە»!
لێرە هەتاو
لەو جێی جارانی هەڵنایە
گەڵا ڕەنگە سەوزتر بێ
بەڵام هەوا
بۆنی ئەوینی لێ نایە!

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

خانوو
وێنەی نەردیوانی فریشتەن و بەرەو عەرشی خوایی دەڕۆن
شەقام
پڕپڕ لە پەرین و دایمە خەریکی هاتوچۆن
ڕابواردن و شاران دیتن وەک مەی وایە
هەر دەمدەم و کەمکەم خۆشە
زۆر مانەوە بەهانەیە
دار و بەردی ئەم وڵاتە
پڕپڕ لە بۆنی غوربەتی و
قسەی ساردی بێگانەیە!

باکۆ_ ٨٦/٣/٢٨

## شەوێ لە نیاگارا

نیاگارا، لە لای خەڵکی ئابشارە
بەڵام ئێستاکە لەم شارە
شوێنێکە هەر عەینی بەهەشت
پڕ لە پەری و شەڕاب و حۆری و بێخەمی
چاو نازانێ چاو لە چی کات؟!
پێ نازانێ بو کوێ بڕوات؟!
هۆ پەریلە! چاوم لێیە
چاوت وەک سانیەی ساعاتە
بەڵام دڵت لە ترسی حەسوودی کابرات
وێنەی دڵی ئەمن ماتە
تا دێ باکۆم پێ خۆشترە
وڵات خوشە
بەڵام لێرە ئازادی یەکجار دڵگرە!

باکۆ/ بادۆ- شەوی ٨٦/٣/٢٩

## غەریبە

لەو وڵاتەی کە هیچکەس تۆ ناناسێ
بەهەشتیش بێ
سەرت ئاخری هەر دەماسێ!!!

باکۆ- ٨٦/٣/٣٠

## دەنا کورتێ

**بۆ ڕۆحی هونەرمەند سەید عەلیئەسغەر کوردستانی**

ئێوارێیەک
بە لۆژەلۆژ
ئەو کاتەی وا پێلی دەریای تووڕەی خەیاڵ دەمهەژێنێ
ئەو کاتەی ڕۆژ دوایین چاوی لە لووتکەکان دەقرتێنێ
بە سەر پردی هەودای شیعرێکی بەستەڵەک ڕادەبوورم
لەپڕ دەنگێ،
لە پەنجەرەی دیوەخانێکی بەرزەوە
لەگەڵ بزەی چاوجوانێکی سرکی ڕووخۆش
هانە ناو دەروونی ڕووخاو
بەڵام بە ڕواڵەتی خامۆش

لەبۆ تەشقی ئاسمانێکی سەرسەوز و پڕپیتیان بردم:
«دەنا کورتێ چت لێ کردم»
ئای کۆترەباریکەی تیژباڵ!
هۆ سەقرە تیژڕۆکەی چاوکاڵ!
مەڕۆن، مەڕۆن، ئەوا منیش کەوتمە سەرباڵ
دەڕۆم بەرەو ئاسۆی شەپۆلی ئەم دەنگە
ڕوو بە بزەی ئەو غونچە گوڵەی سەرپەڕ پڕ پڕ لە ئاوەنگە
هۆ سەقرەکان!
تۆخوا لێرەم جێ مەهێڵن
لەگەڵ خۆتانم ئاخر
لەم ئێوارەی لای شێوانە باڵی هەڵفڕینم گرتووە
گوێم تێوە بوو دەنگێکی تیژی ئاشنا
لە پەنجەرەی دیوەخانێکی بەرزەوە
لەگەڵ بزەی چاوجوانێکی سرکی ڕووخۆش
داودئاسا دەنگی داوە
ناسیمەوە،
باڵم گرت و منیش هاتم بەرەو گەردنە خۆشەکەی متفەڕکی لای
«سەڵوەتاوا»
دیسان دەنگە،
نزیک نزیک نزیک ئەبێ و
لە حەنجەرەی مەکانەوە دەچریکێنێ:

«دەنا کورتێ چت لێ کردم
بە قسەی خەڵکیت لەگەڵ کردم»

## محەمەد سەعید نەجاری (ئاسۆ)

***

به دوای دەنگە
چاوم خولخولەی بین خواردوون، له جێگای خۆم هەڵدەسوورێن
منیش بێدەنگ وشک هەڵاتووم
دەتکوت دەنگە بەرقی هەبوو
دەزانم دەنگە هی کێ بوو
بەڵام شەپۆلی ئەمجارەی لەگەڵ جاران
عەزر تا ئاسمان فەرقی هەبوو
ئەمجار ڕۆحی سەید عەلیئەسغەری زیندوو
دێته گیانی گەروومەوە
منیش به تاری حەنجەرەی شیعرێکی تۆسن و سەرکەش
ئەچریکێنم پر به دۆڵی «ئاویەر، ئاریز و کوچکەڕەش»
هاوار دەکەم:
کورتێ، کورتێ
زۆر لەمێژه ڕۆحی شەیدام هەڵوەدای دیتنی تۆیه
چۆن مەڕە کێوی چاو نەخەو، تا بەیانی چاو له کۆیه
زۆر لەمێژه ڕۆحی منیش
به هەوای هەڵمژینێکی شنەی خۆشی کوێستانی بەرۆکی تۆیه
بۆ لێم ونی؟
بۆ خۆتم لێ دەشارییەوە
کورتێ مەڕۆ، مەڕۆ
ئەگەر بچیته ناو هەورانیش دڵنیام بۆم دەبارییەوە

***

کورتێ بووکە ڕازاوەکەی لە تۆی جلی شیعری سوورا
کورتێ جوانە پەروەردەکەی خوێنی هەتاو
لە ناو پەردووی خێر و نورا
هیچ وڵامم ناداتەوە
زانی دڵمەندی ئەم کارەم کە بۆچ هیچ جوابم پێ نادا
خودا کردی و لە پڕ
تریشقەی چەخماخەی هەورێ پڕپیت
هەوری لە سەر کورتێ لادا
تیشکی چاوە پڕ فرمێسک و گەشەکانی
وەک بریسکەی تاوی تینوو
لە ناو شەوەزەنگی ژیندا بگاتە سەر کانیاوی سارد
خۆشخۆش بۆم دەترووسکایەوە
من بێهۆش بووم
کورتێ کردییە بان بەرزی لێم
بە دەنگێکی زوڵاڵ و سیحراوی و خۆشتر لە هەوەڵجار دواندمی
ڕاوەستابووم
ڕواندمی
کردمی بە دارێکی سەرسەوز، پڕ گەڵا و تەڕ
لە سەر کێلی خەیاڵە مردووەکانی زووم چەقاندمی

***

نازانم ماوەی چەن سەعات لێکمانڕوانی
نە من زانیم، نە ئەو زانی

بەڵام لەپڕ کورتێ بووە کۆترەباریکەیی سەرخۆش
دای لە شەققەی باڵ و هەڵفڕی
لە دوا نیگادا پێی گوتم:
«دوام مەکەوە
پێم حەیفە تۆش بە ئەوینم بسووتێنم
بڕۆ، بڕۆ دیدارمان خۆش
گەر عاشق نیت با نەسووتێی
ئەم دیدارەش لە نێو گۆڕستانی دڵتا
بینێژە و بیکە فەرامۆش

***

ئیتر من و قوڵپەی گریان
ئیتر من و فرمێسک و ئێش
لە دوای ئەم یەکەم دیدارەم
لە دوای کورتێ بوومە دەروێش
وەک مەولەوی بە دوای شەمسا
بە دەف و بە شیعر و نەی
بوومە شێتە پەتیارەکەی ناو کۆلانی مەیخانەکان
پیاڵە بە دەس بۆ چۆڕێ مەی
سنە گەڕام
سابڵاخ گەڕام
سەردەشت، بانە، سەقز، بۆکان
پرسیم لە سولەیمانی و هەڵەبچە، شارەزوور

**دەسنویێژی شیعر**

قامیشلیێ و جزیریێ و بۆتان
بەڵام کورتیێ
لە ناو مێشک و خەیاڵمدا شوێنی دیار بوو
دڵی لەگەڵ دڵم پاک بوو
کەچی بۆ خۆی لێم ببووە بووکێکی ڕەشپۆش
لەگەڵ ڕۆحی منا خاک بوو

***

جارجار بە زیندەخەو دەمدی
کیژێ بەرەو لووتکەی کێوەکان هەڵدەکشا
کاتێ چاوم هەڵدەهێنا بزر دەبوو
چاوم وەسەر یەکتر دەنا
کورتیێ بێدەنگ لفکەی لەچکەکەی شۆڕ و جوان
لۆیێ لە هەور، لۆیێکی لە ئەرزی دەخشا

***

ئێستا ساڵەهایە کورتیێ
دەسگیرانی هەتاهەتای شیعر و هەست و عەشق و دەنگ و لاوەتیمە
کە پیریش بم شەرتە خوایە
گراوی دی بێجگە لە ئەو چی دی نیمە
کورتیێ بۆ من هەستە، گڕە، ڕۆحە، تینە
کورتیێ بۆ من ئاوی ژینە
نەک ئاوی ژین وەک ژیانە
کورتیێ لای من «کوردوستانە»

***

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

دڵنیام تا ئەو کاتەی تاڵتاڵ مووی سپی
خەتی ژین‌نامەی ڕوومەتم بە سپیەتی دەنووسنەوە
تا ئەو ڕۆژەی کورتێ ئەبینم بە شادی
بە دڵخۆشی، بە ئازادی
شیعرم بێتە حەنجەرەی سەید عەلی‌ئەسغەر
چاوم بێتە شەمی ڕێگای شەو ڕۆشنگەر
دەستم بێتە یاریدەدەر
پڕ بە گەرووی عەشقێ پیرۆز بچریکێنم
«دەنا کورتێ چت لێ کردم مناڵ بووم تۆ پیرت کردم»
بۆکان-١/٦/٧٣

## سەوزەپۆش

کەنیشکە سەوزەپۆشەکەی شەقامی عیشق و عاتیفە
دڵی من ئەی گوڵێ کە ڕووت
هەوێی هەتاوە بۆ گەشی
دەزانی چەندە عاشقی وتە و زمانی تۆم ئەمن
دە دەی دە گەوهەرێکی دیش لە بەحری ژینی بێبەشی
پەپوولە زەردەکەی ئەوین!
کەمێکی دیش لە زەردی زێڕی باڵەکەت حەواڵە کە
دەبا وەلا چێ ژەنگی خەم لە سەر تەمی خەیاڵەکەت
وەدەر کەوێ ترووسکە تاوی ڕستەیەک
کە دەربخا دڵۆپەیەک
لە بەحری عیشقی پاکی تۆ و لە سەد یەکی جەماڵەکەت
شکاوە شاپەڕی مەلی خەیاڵی شیعری عاشقیم
پساوە تاڵی گشتی هەستی فیکری بیکری لاوەتیم
دە دەی گرێی دە بێوچان بە تاڵی زوڵفە کاڵەکەت
ئەمن فیدای جەماڵەکەت!
کەنیشکە سەوزەپۆشەکەی شەقامی شیعر و عەتری گوڵ
لەمێژە دڵ
خەمینی کۆنەلانی ڕۆژەکانی پێشووە

## محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)

لەمێژە دەستی شیعرەکانی تۆم تەزووی سەهۆڵی مەیلی تێچووە
لەمێژە دڵ بە دیتنت ختیلکە نادرێ و منیش
لە سەر کەژی ڕەشی سەرم
زوقمی تەمەن بلوور بلووری کەوتووە
دە دەی بە ڕەمزی عاتیفەت بەهارە یادگارەیەک
گەزیزەیەک، بەهانەیەک
زرەی تەلی شەوانەیەک
لە باخچە پڕ لە بۆنی یاسی خۆشەویستی حەوشەتان
چەپک کە نا،
تاقە چڵە ڕێحانەیەک
هەتاکوو بەفری لا نساری ڕێی وڵاتەکەت بچنێتەوە
منیش بە هەستی لاوەتی چەلانی جێژوانەوە
قەڵەمبەدەس بڵێم غەزەل
چەکامەیێ، وەلاقەلەن تەرانەیەک
بە دەنگی پڕ لە سۆزی هەستی مەستی عارەقی ئەوین بەکوڵ
وەدەر کەوێ دەروونی پڕ لە ڕەمزی ڕازی خۆشەویستی میللەت و
نەمێنێ بەفر و بەستەڵەک
فڕێدەری حەشارگەری دوو چاوی تۆ و
وەدەر کەون بەڵەک بەڵەک

***

گەزیزەکەم!
ئەوەی کە هەر وتەی دڵت لە تۆی حەریری نامەیەک

**دەسنویێژی شیعر**

پڕن لە ڕازی ویستی گەل بە قەت دڵی چەکامەیەک
من ئەو پەپوولە بیٚوزەی شەمی جەماڵی عاشقیم
لە سەردی مەیلی سوورە گوڵ پڕووزپڕووزە باڵەکەم
دە دەی بە نەشئە خەندەییٚ
بە یادی فەسڵی نەوبەهار
شنەی شەماڵی شادییەک وەرێنە سەردی ماڵەکەم
لەبیرتە ڕۆژەکانی وا
هەتاوی بەختەوەر بە سەر کەژ و چیا لە ژوور و دەر
بە زەردەخەندە زاڵە بوو؟
وە تیشکی نەوبەهاری خۆی لە ڕۆحی پاکی شاعیرا
دەکردە گڕ، چەپکچەپک
غەزەل، شیعر، وتە و مەقام حەلاڵە بوو؟
دە ئەی دە بۆچی چاوەکەم کە ئێستە گیری نەگبەتە؟
ئەسیری هەوری حەسرەتە؟
شەقایقیش لە نێو دڵی زەوی و کەچی لە داخی مەیلی ساردی ئەو
پەڕیوە ڕەنگە سوورەکەی، کراسەکانی لەتلەتە؟

کەنیشکە سەوزەپۆشەکەی شەقامی بەفر و خوێن و گوڵ
دڵی من، ئەی گوڵێ کە ڕووت غەمینی گنجی مەینەتە
بەهارەکەت
بەهاری چی؟!
وەرزی خەم و پەژارەکەت
بەڵێ بەڵێ، هەوارەکەت بەڕێوەیە

**محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)**

مەترسێ هەوری ڕەش وەها بە سینگی پڕ لە عاتیفەی حەویقی ئاسمانەوە
بە چەسپی غەسبی دڵڕەشان
وە نالکێ هەتاهەتا
دەبینم ئەو گوڵانە وا بەڕێوەیە
بزەی هەتاوی شادییان بە لێوەیە
یەقین دەبێ کە ڕۆژێ میللەتی ئەمەش
بە چاوی قەلب و سیرڕ و سەر
نەزەر بکەن بە چاوی گەش
ختیلکەیان بخاتە دڵ
کراسی مەخمەری چەمەن لە بەژنی سەوزی کێوەڕەش
مەترسە سەوزەپۆشەکەم
بەهارەکەت بەڕێوەیە
گوڵاڵەکان
بزەی هەتاوی شادییان بە لێوەیە

بۆکان- شەوی نەورۆزی ٧٤

## وڵاتی من

کەم پێم بڵێن
ئەم شیعرانەت دەورەی کۆنن
ڕابوردووە دەورەی شیعری مەی و ڕوباب
ئاخر گیانە
من شاعیری وڵاتێکم
کە لەوێدا
خوێن هەرزان‌ترە لە شەڕاب!

بۆکان–٧٥/٧/٣١

## شاعیر

کە پێم بڵێن
دە بەسیەتی ئەو شیعرانەی باسی شەڕابە یا کەباب!
ئاخر گیانە من شاعیری وڵاتێکم کە لەوێدا:
«خوێن هەرزانترە لە شەڕاب»!

بۆکان– زستانی ٧٨

# کووچە

**بۆ شاعیر سەفا سمنانی**

به کووچەکەتان‌دا ڕۆییم
تەنیا، تەنیا، هەناسەسارد
هەوری شیعرێکی بێ‌نیشان
به سەربانیماڵتانەوە گێژی دەخوارد
به کووچەتان‌دا ڕابوردم
غەمبار، غەمبار دڵ‌تەنگ و مات
کووچەکەتان بۆنی شیعر و عەشق و بارانی لێ‌دەهات
من غەمگین و عاشقانه ڕادەبوردم
نم‌نم بارانێکی سەوزی ئەویناوی تەڕی کردم
کاتێ هاتم
کۆترێکم دی، لە بەر پەنجەرەی ماڵتانا بە دڵتەنگی هەڵکورمابوو
پێش قرمژنی نیگای تینووی من هەڵفڕی
گەیمە حاستی ماڵەکەتان
شوێنی پێی دۆینێی تۆ مابوو
هێمان ڕۆحی عەشقی تیابوو

بۆکان_۷۳/۹/۲۸

## قسەی دڵ

زۆر جار هاوالآن پێم دەڵێن کە تۆ لە ناو شیعرەکانتا باسی قسەی دڵت ناکەی!
منیش بەم تانەی یارانم
لە داخا وەک مۆم[1] دەسووتێم
ئاخر برا،
قسەی دڵم شیعرێکی ئاگراوییە
ئەگەر بیڵێم خۆم دەسووتێم!

بۆکان_٧٥/٧/٧

## دیمەنی کچێکی سواڵکەر

چمۆڵەیە
ڕوو بە شادی و بەزم و مەجلیس
دڵتەنگی من بەو دیمەنە
هاوارێکە،
جنێوێکە ڕوو بە ئێسکی هەڵپرواوی ڕێبەرانی زاڵمی گەل
یاخۆ پاشای پیسی نگریس!

شنۆ_ ٧٦/٦/١٣

---

١) مۆم: شەمع

## هەوری لە مل

هەوری لە مل!
کاتێ تینی نیگای گەرمت
هاویشتەوە کوێستانی سڕ و ساردی دڵ
لە گوڵجاڕی دڵی شەیدام سەدان نێرگس یەک‌یەک پشکووت
بەرەبەیان، کاتێ تیشکی هەتاو ئەنگووت
من خەریکی چنینی گوڵ‌ئەستێرە بووم لە شەوگاری ڕەشایی مووت
هەوری لە مل!
تۆ خەڵکی کام مێرگەزاری ئەوینداریت؟
کە وا تیشکی نیگای وێڵت تەوێڵی ئەسرین دادێنێ؟
تۆ خەڵکی کام سەرزەوینی عەشق و جوانیت؟
وا لاتیلی بزەی ساردت دڵی خۆرەتاو دەکولێنێ؟
بسکت ئاڵۆزی کام باڕەش، کام تۆفانە؟
وا هەر چڵی زوڵفی سیات بۆنی غوربەتی لێ دەکرێ
جارجار بە دزە لە سەر لێوت بزەی شادی شین دەبێ
سەدان کۆرپەی ئاواتی بەجێ‌نەهاتوو بە دوای پێلوی چاوتا دەمرێ
کات بەیانێکی سەرسەوزە و
شوێنمان باخەڵەیێک غەریب
کە تەنانەت بۆنی گوڵانیشی نامۆن
کەچی دڵی پڕی ئەمن خەرمانێکی پڕ لە پیتە
دەنکەدەنکە دەخڵ و دانی، بزەی لێوی ئاشنای تۆن
هەوری لە کۆڵ!

**دەسنویێژی شیعر**

خۆ دەزانم ئەوین کۆترێ دەستەمۆیە و
لە سەربانی هەموو ماڵێ دڵی تەڕدا بە تەقڵە دەنیشێتەوە
بەڵام چ بکەم؟
سەربانی ماڵی عەشقی من هێندە بەرزە
شەققەی باڵی مەلی عەڕشیش بە ساڵی جارێ نابیسم
کەچی دەڵێی لەو سەربانە تووک لێ کراوە
وردەوردە کۆتری ئەوین دەخولێتەوە
هەوریلەکەم!
توخوا بڵێی خوا بکا و وا زوو بنیشێتەوە؟

ڕێگای تەوریز ـ ٧٦/١١/١٥

## بەتەنیا

تەنیا، تەنیا
وەک گەڵایێ لە دار جویێ بێ هەر بە شینی
شەقام پڕ لە خەڵک و
دەڵێی دارسانێکی چۆڵ و هۆڵە
ماشین وەک پەپوولەی سەرشێت hارووژاون
منیش تەنیا
بێ جێی شوێنی حەسانەوە
شەماڵی یادت دەمبات و هەڵمدەگرێ
چاوی یادت سپی‌سپی
چونکا لە هیچ قوژبنێکا سێبەریشت ناکا بەدی
ئاخ کە من ئەمشەو چەن تەنیام
ئاخ چارەنووس چەن دڵڕەقە
بەڵام هێشتا بێ‌هیوا نیم
نێو چاوی خۆم ئەوەی حەقە

مهاباد_ ۷۲/۳/۹

## وەرگێڕاوی غەزەلێکی حافز

لەم دەور و زەمانەی ئەوی پڕ فێڵ نەبێ لە گەل
پیاڵەی شەڕاب و شیعرە ئەویش تایبەتن غەزەل
ڕووخانی دەبێ بەردی بناغەی چ خانوویێ
خانووی ئەوین نەبێ کە قەتی بۆ نەبوو خەلەل
سەر گەردەنەی سلامەتی جەردەی فرەن، دەخیل!
بێ پیالە نەڕۆی! زۆر سەری کردۆتە کاسە کەل
زولفی کچە شۆخێکی لە ئەستۆ کە، لێی مەلێ
گەر بەخت و هاتی زوهرە بوو یاخود ئەگەر زوحەل
بڕوانی بە دوو چاوی زرنگی ئەگەر لە ژین
دونیایی کۆن و کاری جیهان عەینی جامی پەل
هیوام بە ژیان زۆرە بەتایبەت بە وەسڵی تۆ
هیچ ناکرێ کە ئیزن گەر نەدا ئەجەل
هەر من بەتەنێ تووڕە لە بێ«کردەوە»یی نەبووم
پسپۆڕی جیهان گشتی دژی عیلمە بێعەمەل
لام وایە کەسێ حافزی باهۆشی نەدیتبێ
هێند مەستی کرد لە جەڕەی «بادە»کەی ئەزەل

وەرگێڕانی «ئاسۆ»ـ بۆکانـ ٧٣/٢/٣٠

## لاڵەی هجران

**به همراه بی‌نشانم: ز_ توکّلی**

گر شرح دهم لَختی داغِ دلِ شیدا را
چون لاله بسوزانم آن سرِّ هویدا را
خالی نبوَد آنی از یُمن کلامت دل
باور نکنم دانی احوال دل ما را
ای کفتر گم‌گشته! باز آ که من از هجرت
کتمان کنم از دیده آن گوهر پیدا را
ای شبنم صبح از تو، وی قطره‌ی اشک از من
تا کی سِزَد این سودا، بیچاره‌ی سودا را؟
هم در دل و هم جانی، با مایی و پنهانی
فرقی ننهم آنی پنهان و هویدا را
یادی کن از این خسته، این بلبل پر بسته
چون گشت فراموشت میقات مصلی را؟
باز آ، «افق» از هجرت مجنون و ولی کُرد است
لیلای منی مشکن، آن عهد و وفا یارا!

ارومیه، بهار ۷۰

## دیار

دیده غرق خون شود گر کوی یار آرم به یاد
سینه گردد خون‌فشان بوی دیار آرم به یاد
بوی گل، بوی بهار، از بوی تو دارد نسیم
زین سبب در مهر مه بوی بهار آرم به یاد
بی تو چون برگی نحیف‌ام ریخته، پژمرده، زرد
تا که خود بینم خزانِ روزگار آرم به یاد
بی برَ و بارم، چنان تنها، که می‌لرزم چو بید
در فراقت ای صنم کی برگ و بار آرم به یاد؟
من شنیدستم ز روز حشر و حرّ و ترس وی
زانکه بی تو بودنم در سبزوار آرم به یاد
از «افق» تا سرخی خونِ شهادت دیده‌ام
گاهِ مردن مرگ با عزّ و وقار آرم به یاد

سبزوار، مهر، ۱۳۶۸

## برای تعمیر مسجد قبله

ایـن همـه آهـن‌آلات وجـه‌الضـمان نـدارد؟
خـرج کجـا کنیـدش، آنجـا کـه آن نـدارد؟
قبلـه کجاسـت آخـر رو بـه کجـا کنیـدش
خانه‌ی دوست قبلـه‌ست، او کـه مکـان نـدارد!
بیـــدلی ار بجویَـــد چیســـت نشـــانه‌ی او؟
بـا چـه زبـان بخـوانیش؟ او کـه زبـان نـدارد!
رو سر خویشتن گیر و غـرق ریـای خـود بـاش
کِـی تـو ببینـی ایـن جـاش او کـه نشـان نـدارد
اوست مرا چو رحمت بهر تو رزق و روزی‌ست
گـر چـو مـنش شناسـی خانـه چنـان نـدارد
در پــی آب و نـــانی، غـــافلی، آن‌چنـــانی
کلبـــه‌ی رحمـــت وی زحمـــت نـــان نـــدارد
تـن چـو سـتور پـر خـور، جـان ز تـلاش خـالی
آهـــن و زرق و برقـــت ارزش جـــان نـــدارد
گـــر بشناســـی او را بشـــکنی ایـــن ســـبو را
ســنگِ دل آب گــردان دل کــه میــان نــدارد
سوی «افق» نظر کن قبله‌ی دل همان‌جاست
مسجد و دِیر و قبله شرح و بیان ندارد

سقز ـ ۸۶/۴/۱۳

## تضمین

**به گرامی دبیر ادبیات بوکان: محمد یزدان‌پناه**

حرمت شاه نه اورنگ نگه می‌دارد
نام وی نفرتِ از ننگ نگه می‌دارد
گل که فخرش به جهان حسن خداداده و لیک
گاه رفتنْش نه این رنگ نگه می‌دارد
شاد کَیْ گردی از این ورطه که غرقاب بلاست
صلح را پس زده و جنگ نگه می‌دارد
حیف از آن آینه کو لطف و صفایش باید
که درین کلبه فقط زنگ نگه می‌دارد
خواهی ار چین غمت نقش جبین حک نکند
عشق او ورز، ترا شنگ نگه می‌دارد
تکیه بر پای تعقل چو کنی چوب قدر
پای چون سرو ترا لنگ نگه می‌دارد
پدری پاک جهان‌دیده نوشت این تک بیت
که مرا همچو مُلْ آن منگ نگه می‌دارد
«گر نگهدار من آن است که من می‌دانم
شیشه را در بغل سنگ نگه می‌دارد»

بوکان، ۷۵/۱/۲۹

## یاری

اشکءهایم را دو چشمان تو جاری کـردەانـد
آری آری یارهـا تـا بـوده یـاری کـردەانـد
آه از این فریادهـای مانـده در حلـقِ سـکوت
خود سکوتی گشته از بس بی‌قراری کردەاند
من خـراب آن وداع تلـخام و نـی مسـت مَـیْ
آن کسان دانند اگر زین میگساری کـردەانـد
ای خوشـا آنانکـه در بـازار عشـق و عاطفـه
جز محبت آنچه را باشـد حصـاری کـردەانـد
آنکه بـا رهـوار عقـل انـدر میـان رانَـد فَـرَس
لاف مـی‌بافنـد دائـم نـی‌سـواری کـردەانـد
بـی هواخـواهی تـو زاهـد عبـادت گـر کنـد
آن عبادت نیست بلکه خود قماری کـردەانـد
نور جویی از «افق»؟ بنمـای خورشـیدِ رُخَـت
یاد شوقت رگ رگم را همچو تاری کردەاند

ارومیه، ۷۴/۱/۱۸

## نگاه(۱)

**به دوستم نادر قادری**

وه که نگاه تو چه‌ها می‌کند![1]
کودک دل را چو صدا می‌کند
از نگهت پُرس که این ظلم را
با دل غمدیده چرا می‌کند؟
بین که در آن موج شط سینه‌ات
ماهی احساس شنا می‌کند
صید دلم گشته‌ای و صیدگر
صید نوش را نه رها می‌کند
بسته به منقار شود هر کسی
دانه ز دام تو جدا می‌کند
تابش مهتاب رخت در شبم
شور غمی تازه به پا می‌کند
هر که جدایی ز تو داند صواب
بار خدایا چه خطا می‌کند
وانکه مرا با تو نشانَد دمی
غزوه‌ای در راه خدا می‌کند
آه، غمت در افق عشق من
نشو و نما، نشو و نما می‌کند

بوکان، اسفند۱۳۷۴

---

۱- مصرع اول غزل از «امیر حقیقی» است.

ساقی اگر خِبره بوَد داند اگر چه می‌کند؟
هوش در آن مستی ما در دل سر چه می‌کند؟
در قدح لاله بریز آن میِ اشکِ تاک را
خط جبین را بِهِلِش تا بنگر چه می‌کند
موسم گل شد رفقا بلبل سرگشته کجاست؟
سنگِ گُل آورد ولی نسل بشر چه می‌کند!
سینه‌ی باغ را ببین، لاله‌ی داغ را ببین
ماهِ چراغ را ببین تا به سحر چه می‌کند!
منتظران یاد را بر دَمَن و دشت بخوان
بر غم فوت بوسه‌ای چشم به در چه می‌کند
بوسه بزن بر لب جام و یاد لعل یار کن
یار وفادار بگو عمر هدر چه می‌کند؟
فصل شباب بگذرد، تا غم فردا نخوری
خاك بر افلاك شود بنده‌ی زر چه می‌کند؟
سبزه بروئید لب کرسی انتظار من
چشمه‌ی خون گشت دَمَن با دل تر چه می‌کند؟

بوکان، اردیبهشت ۷۷

## آن ـ این

ما را که خنده‌ی آن خاطره‌ها یاد می‌کند؟
خمیازه‌ی اندوه کجا شاد می‌کند؟
اندوه نوگل سرما چشیدگان جور بین
چون باد در دل ما ساری و بیداد می‌کند
کو ارتعاش می‌دهد آن باد تار صوت را؟
تا این گلوی اشتیاق چنین باد می‌کند
«بهمن» که ظاهر او جاذب و کولاك می‌کند
یادی به حسرت از این موسم «خرداد» می‌کند
دوشیزه‌ی شادی، غم شیرین زندگیش
یادی‌ست سبز که بر تیشه‌ی فرهاد می‌کند
از پارس‌ها مَهَراس ای «افق» بتاب خوش
اشکی بریز تو بر یادی که از قوم ماد می‌کند

بوکان، ۷۷/۹/۱۴

## همراه

**به برادر ارجمندم خالد قلعه‌کوهی**

تـــرا کردگـــارم ز نـــاز آفریـــد  مــرا هــم سراســر نیــاز آفریــد
جمـال تـرا بهـر مـن رمـز کـرد  مرا هم چه بی رمز و راز آفریـد
از آن بـا نگاهـت گـُدازد دلـم  ترا سـوز و مـن را گـُداز آفریـد
بدانست کو من چه مجنون‌وَشـم  چو لیلی ترا شوخ و شـاذ آفریـد
خرابات عشقم چو مخروبـه بـود  تـرا همـرهم کـرد و بـاز آفریـد
تو خاموشی و من چو نی در نـوا  نگاهت ز مـن روح سـاز آفریـد
مـرا در حـریم طلـب‌گـاه عشـق  چنـین شـاعری پاکبـاز آفریـد
مرا کـُرد یغمـا دل و دیـن نمـود  تــرا دختــری ترکتــاز آفریــد
ببین این «افق» را ز شوق رخـت  غـزل را بـه قـدس نمـاز آفریـد

مهاباد ـ ارومیه، پائیز ۷۲

## رسوا

من که رسوای تو گشتم از چه اندیشم دگر
از همه بیگانه‌ام با یاد تو خویشَم دگر
سودی از دنیاپرستی نیست حاصل در جهان
تا گدای تو شوم درویش دل‌ریشَم دگر
چند در دریای فکرت غرق کشتی، غرق گِل؟
ساحل عشقم کرانه، ضد تشویشَم دگر
کس به گردم نارسد در راه پر آشوب عشق
چونکه در دیوانگی از قیس هم بیشَم دگر
تا که گلزار رخ تو شد حریفم، باختم
نیست یاور هیچ فرزینی که من کیشَم دگر
جز خیال وصل تو سودایی در سرْ کو مرا؟
جز ره وصف تو راهی نیست در پیشَم دگر
هم خراسان، هم عراق و اصفهان را دیده‌ام
بازگشتم، واله‌ای از «ساریقامیش»م دگر
کُردم و عشق تو ما را پارسی آموخت لیک
تا «افق» رنگین شود از هیچ نندیشم دگر

بوکان- بهار ۷۴

## یاد

باز یاد مهر آن نامهربان افتاده‌ام

همزبانی کو که من بی‌همزبان افتاده‌ام؟

راهم از چاهم نبود آن آگهی فرقی نهم

در چَهِ سیب زنخدان ناگهان افتاده‌ام؟

بر هوای کوی او لاف لطیفی می‌زدم

حال در میعاد رندان سر گران افتاده‌ام

کشتی بی ناخدایَم در میان موج درد

دور و ناپیدا کران، بی بادبان افتاده‌ام

در حریم زلف او همراز بسیاری دلم

نیست باکم گر ز چشم بی‌دلان افتاده‌ام

نیست پایابی در این گردابِ بی‌پایانِ عشق

آشنا! من بی شناکردن در آن افتاده‌ام

قیس کُرْدَم لیک لیلایم مرا مجنون نکرد

از نیاز با تو بودن اینچنان افتاده‌ام

تا نگاهی بر افق کردی ز روی مرحمت

من به یاد آن نگه بی خان و مان افتاده‌ام

بوکان، ۷۵/۲/۳۱

## عشق جاودانی

مـن فریـب زنـدگانی خـوردەام
بـادەی عشـق نهـانی خـوردەام
یـاد چشـمان تـو مستم مـی‌کنـد
گـویی آب زنـدگانی خـوردەام
همزبـانی کـو نیوشـد راز دل؟
چوب این بی‌همزبـانی خـوردەام
یـار همــراه و نبیــنم روی او
«صبر» تلخ «لن ترانـی» خـوردەام
موسی دل گویدم لب دوز و مـن
گوئیـا شـیر شـبانی خـوردەام
یک نفس بی عشق نسپردم رهـی
آب عشـق جـاودانی خـوردەام
بـادەی هجـر تـو پیـرم مـی‌کنـد
لیک من گول جـوانی خـوردەام
هر زمان عشقی به فریادم می‌رسد
تـا غـم ایـن بـی‌نشـانی خوردەام
بـی‌نشـانی بهتـر از آتـش «افـق»
کی غم این بی‌نشـانی خـوردەام؟

ارومیه، ٧۴/١/١٧

## بازگشت

باز آمدم، باز آمدم، با این دل شیدایی‌ام
باز آمدم، باز آمدم، با این غم و تنهایی‌ام
دانی چرا باز آمدم هر چند رسوا کردی‌امْ؟
دانم که می‌خواهی مرا با آن همه رسوایی‌ام
دیری‌ست روحم تشنه‌ی باران ابر عاطفه است
کو آذرخش یک نگه در این شب یلدایی‌ام؟
غم ایستاده بر دَرَمْ، روح صداقت در بَرَم
چتری‌ست حرمان بر سرم از شور جان‌فرسایی‌ام
ای مونس شب‌های من! هم درد و هم دریای من!
در خود بگیری گر مرا من گوهری دریایی‌ام
ای سرمه‌ی چشم جهان! خونی مرا در رگ جهان
تا تازه گردد جانم و افزون شود بینایی‌ام
پرتو بیفشان از «افق» می‌خواند اینک مرغ صبح
مگذار پیری بشکند این شور و بزم‌آرایی‌ام

بوکان، ۷۵/۴/۲۵

## دانه

من به بوی تو در این ورطه‌ی ویرانه شدم
بـه امیـد لـب تـو تـارک پیمانـه شـدم
در حـریم خـم ابـروی تـو راهـم گـم شـد
سـر بـه سـر شـیفته و والـه و دیوانـه شـدم
وه که دیوانگی روی تو بر من چه خوش است!
تـا کـه مجنـون تـواَم عاقـل و فرزانـه شـدم
انـدرین مرکـز ایـران چـه پـری بسـیارند!
پریـا! مـن بـه رخ شـمع تـو پروانـه شـدم
منگـر اینجـا کـه چنـین محـو تماشـا شـده‌ام
با غم خوب تـو دیـری‌ست کـه همخانـه شـدم
ار گـدای غـم عشـق تـو شَـوَم شـاه شـده‌ام
خـوش بـر آنـم کـه سـر زلـف تـرا شـانه شـدم
به خدایت دل مـن بـر همـه کـس دلـدار اسـت
آشـنا بـا تـو شـدم، از همـه بیگانـه شـدم
«افـق» ار بـا تـو کمـی دم ز محبـت کـم زد
تـو پـی دام بُـدی، لیـک تـرا دانـه شـدم

تهران، پارک ساعی، ۷۸/۱/۲۶

## آرزومندی

ایـن بـار نمـردیم و بـه هـم بـاز رسـیدیم
یـک جـام دگـر از لـب لعـل تـو چشـیدیم
بی گوش و زبان رازی که در قلب نهان بود
بـا گـویش پیونـد نگـه گفـت و شـنیدیم
هر چند که چشم تو حکایت کنـد از یـاس
مـا جـز طلـب از وادی عشـق تـو ندیـدیم
در پـرده نهـان مـی‌کنـی آن چهـره و لـیکن
بـا عشـق تـو صـد پـردەی پنـدار دریـدیم
دیـدی همگـان دوختـه بـر مـا نظـر و مـا
از وحشـت اندیشـه‌کَجـان زود رمیـدیم
از نـیش وداع و ز تـب تلـخ جـدایی
بر کالبـد و قلـب هـم ای بـس کـه خلیـدیم
چـون کفتـرِ غلتـان پـر انداختـه؛ امـا
بـی بـال تپیـدیم و چـه مجبـور پریـدیم
نو کرد غمـی کهنـه «افـق» را دل و شـعرش
افسـوس رسـیدیم و بدیـدیم و نچیـدیم

تهران، ۷۱/۱۱/۲۶

## راز

بـا مـن از آن راز پنهـانی بگـو　　از دو چشـم پیـر کنعـانی بگـو
مـرد مردانـه ز هجـران دم مـزن　　رازهـای پـاك و انسـانی بگـو
با سبك‌رو حان گران‌جانی مکن　　بـا مـن از آن راز روحـانی بگـو
بـر مـنِ آشـفته‌حـالِ پـر ز درد　　داسـتانِ عشـقِ صـنعانی بگـو
گر تو هم چـون دیگـرانِ بـی‌وفا　　مـی‌روی، پیشـم نمـی‌مانی بگـو
از زلیخـا، از منیـژه، از همـه　　از خـودت، از هرچـه مـی‌دانـی
بوی هجرت می‌دهی، کوچیده‌ام!　　بنـدری! از روم و رومـانی بگـو
مـن شـهید زنـده‌ی عشـق و دل‌ام　　تو اگـر بـی عهـد و پیمـانی بگـو
در کنـار سـبز اقیـانوس عشـق　　از غـروب مـاه «تـورانی» بگـو
مـن سـکوتم نالـه‌ی فریادهاسـت　　گر تو هـم از عشـق نـالانی بگـو
تا «افـق» روشـن شـود از مهـر تـو　　راز شعرم را چو می‌خوانی، بگو

بوکان- ۷۷/۱۲/۱۴

## مراد

فرض عین است اگر با منِ دل‌خسته شبی
همنوا گردی و گویی چه مرادی طلبی
وه که از شدت شادی نتوانم گویم
نار یا سیب زنخ یا رطبی یا عنبی؟
زلف بر باد ده و پخش و پریشانش کن
تا بیابم دل زندان‌شده‌ام بی‌سببی
یا رب این نوگل خندان به من ارزانی دار
که شَوَم همنفسِ سیده‌زادِ عربی
هر که با آل تو همراز شود پیروز است
ای محمد که قریشی و مُطهَّر نسبی
قلم از دشت چشمان تو جوهر فِکَنَد
گر نویسد سخن از مدحت آن لعل لبی
راه از چاه ندانم چو به من نگری
سرم از پا نشناسم دَهی‌امْ گر رطبی
یار اغیار مشو! کس چو منت نشناسد
باده‌ی بی‌لعل لبت داد به من وه چه تبی!
یا «افق» را به ثناخوانی خود خوان همه روز
یا مرادش بده از لعل لبت شمسه شبی

بوکان- سقز- ۸۵/۱۲/۲۳

## ای مهر من امشب تو چه زیبا شده بودی؟

دلبـر نـه، دل‌انگیـز و دل‌آرا شـده بـودی
دوشینه اگر قمـری و طـاووس بُـدی بـاز
امشب گُهَری بهتر از این‌هـا شـده بـودی
شهباز نگاهت پی گم‌گشته‌ای می‌گشـت
خوی کرده رخ و زلف چلیپا شده بودی
از شـــربت اشـــعار طـــرب‌زا و دلاویـــز
چون طوطی گویای شکرخا شده بـودی
از بَهــر مــنِ بیــدلِ حیــران، مَــه پنهــان
بـر مجلسـیان مجـری اجـرا شـده بـودی
بــا آن نفــس گــرم و دم عاطفــه‌زایَــت
پنهــان ز نگــاه مــن شــیدا شــده بــودی
من قیسِ کُهِ نجد فراقت؛ ولـی افسـوس
در مجلـس بیگانـه تـو لـیلا شـده بـودی
هر چند که پنهان بودی از چشـم رقیبـان
در عـین نهـانی چـه هویـدا شـده بـودی!
این حرف دل زار من گفت «عماد» است
«گم‌گشته‌ی ما بودی و پیدا شـده بـودی»
از بهـر «افـق» چـون مـهِ خـردادِ گذشـته
هم لیلی و هم شمس و مسیحا شده بودی

مهاباد، ۷۲/۸/۱۶

## مهمان

دیشب گل گلخانه و جانانِ که بودی؟
ای شمع شب‌افروز! تو مهمانِ که بودی؟
امروز من از هجر تو همخانه‌ی اشک‌ام
دیشب تو نیوشنده‌ی هجرانِ که بودی؟
پیمانه به یاد تو تهی کردم و افسوس
معلوم نشد بر سر پیمانِ که بودی
من بلبل سرگشته‌ی گلزار تو بودم
تو غنچه‌ی خندانِ گلستانِ که بودی؟
من غصه‌ی هجران ترا شرح نمودم
تو شمع شب‌افروز شبستانِ که بودی؟
من در چَهِ بیژن به دو چشم تو امیدم
تو نَخشب نورانیِ زندانِ که بودی؟
دیشب که تمنای یکی بوسه نمودم
در فکر چه بودی و شتابانِ که بودی؟
بشکستی تو آیینه‌ی احساس «افق» را
ای سنگ‌دل امشب گل گلدانِ که بودی؟

بوکان ـ ۷۷/۱۲/۲۷

## گل‌پرست

نمـــی‌دانـــم ای دل چـــرا ایـــن چنینـــی
چـو پروانـه بـر گـل رسـی مـی‌نشـینی؟
چـــو بوســـیدی آن آســـتان مقـــدس
مکـــانی ســـزاوار برمـــی گزینـــی
بســـوزی، بســـازی، بنـــالی ولـــیکن
جـــز از شـــوق دیـــدار کـــس را نبینـــی
نـــدانی کـــه خنجـــر برآهیختـــه خـــار
زنـــد بـــر دلـــت تـــا بخـــواهی بچینـــی؟
صـداقت پَـرش نیسـت آبـی چـو بالـت
چـو پـر مـی‌گشـایی نـه اهـل زمینـی
نـدانی کـه دانـم مـرا خـوار کـردی
و دانـــی کـــه دانـــم چـــرا تـــو غمینـــی
کســـی را ندیـــدم بـــدین گـــل‌پرســـتی
بلـــه ای دلِ غافـــل مـــن! تـــو اینـــی
«افق» سرخ گشته‌ست پَر زن که دیر است
ولـــی تـــا گلـــی را نبـــویی نچینـــی

تبریز- بهار ۸۰

## بهار بوکان

آیـد انـدر عشـق سـبزی تـار شـادی‌هـای مـن
تـــا نســـیم دل‌فـــروز نوبهـــاران مـــی‌رســـد
ارض کردسـتان بهشـتی مـی‌شـود اردیبهشـت
تـا خـروش نوبهـارانش بـه بوکـان مـی‌رسـد

❊❊❊

در فضـای پـاک جنگـل‌هـای اطـراف و دَمَـن
رمـــز پابرجـــایی‌اش را بشـــنو از رقـــص چنـــار
ســـنبل افتـــادگی بـــین شـــاخه‌ی گـــیلاس را
رود سـیمینه چـون طغیـان مـی‌کنـد گـاهِ بهـار

❊❊❊

در نفـس‌هـای پگـاه شـهر بوکـان بـوی عشـق
از افـق چـون هالـه‌ای آیـد بـه معـراج دمـاغ
وه چه رنگـین مـی‌کنـد سیمای شـهرم را بهـار!
صوت بلبل، موج رود و ساز عشق و شـکل بـاغ

❊❊❊

